بێگومان ، ئەو سزایەش جۆرێکە ، لە پەروەردەی خودایی بۆ نەوەی ئادەم تاوەکوو واز لەو یاخیبوون و سەرپێچیکارییەیان بێنن ، جا ئەگەر، خودا بیەوێت و ویستی لەسەر بێ ئەوا لە توانایدایە هەموو خەڵکی لە بنەوە ڕیشەکێش بکات .

سەرنج بدەن خودای مەزن چی دەفەرمووێت :

(وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَابَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى ....)[1].

تەماشای سۆزو میهرەبانی خودای مەزن بکەن بۆ نەوەکانی ئادەمیزاد کاتی زیاترومۆڵەت بە تاوانکارو گوناهباران دەدات تاوەکو ، پەشیمان ببنەوە لەو یاخیبوون وسەرپێچییانەی ڕۆژانە ئەنجامی دەدەن.

ئەگینا بیەوێت سزای خۆی بەسەر گیانلەبەران دەسەپێنێت بەجۆرێکی وەها کەس ڕزگاری نەدەبوو لەو سزایەی .

بۆ زانیاریتان ئەم ڤایرۆسی کۆرۆنایە باوەڕدار و بێباوەڕی گرتۆتەوە مەسەلەکە ئەو ناعەدالەتی و ستەم و ستەمکارییەیە کە تەشەنەی سەندووە لەسەر تاپای جیهان فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ **زۆر روون وئاشکرایە باس لە** (النّاس) **دەکات .**

واتە : هەموو کەسێکی گرتۆتەوە ، موسڵمان بێ ، یا کافر بێ ، کورد بێ یا عەرەب ، لە هەر تیرەو هۆزە عەشیرەتێك بێ ، هەر بیرو باوەڕێکی هەبێ.

بەواتا گشتگیرییەکەی (العام) لە هەر شوێن و ئاوەدانییەك ناعەدالەتی و ستەم و ستەمکاری و خراپەکاری هەبوو خەڵکانی ئەو دەڤەرە بەرەنگاریان نەبوونەوە ئەوا بە چاك و خراپەوە ، باوەڕدارو بێباوەڕەوە دووچاری سزای خودا دەبنەوە زوو بێ یا درەنگ .

---

[1] سورة فاطر الآية ٤٥ .

سەرنج لەو ئایەتە بدەن خودا چی دەفەرموویێت :

﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾[1].

كەواتە : باجی وازهێنانمان لە فەرمان بە چاكە كردن و ڕێگری كردن لە خراپەكاری زۆر قورسە وەكوو ، دەبینین بە چاوی خۆمان كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەسەر تاپای جیهان دووچاری ڤایرۆسی كۆرۆنا بوونەتەوە بەجۆرێك ، جیاوازی ناكات لە نێوان بەهێزو بێ هێز ، دەوڵەمەندو هەژار، موسڵمان وكافر .

هۆكارەكەشی زۆر بە ڕوونی دیارو ئاشكرایە ئاماژەمان پێكرد بەڵام دەتوانین لێی دەربازبین ئەویش بە گەرانەوەمان بۆ لای خودای باڵادەست بەشێوەی كردەیی نەك بە زمان .

واتە : هەركەسە لای خۆیەوە دەست پێ بكات و تەماشا بكات مافی كەسێكی خواردووە بە زووترین كات بیگێرێتەوە ، وە یا كەسێكی ڕەنجاندووە یا ئاشتی بكاتەوە یا ... یا ... یا... هتد.

خاڵی دووەم : لە هۆكاری بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە دیدی ئیسلامدا

پشت گوێخستن وگرنگی نەدان بە ڕێنماییە تەندروستییەكانی شارەزاو پسپۆران لە بواری تەندروستی هۆكارێكی ترن بۆ تەشەنە كردنی پەتاو نەخۆشییە گواستراوەكان .

كاتێك باس لە چۆنیەتی خۆ پاراستن لە نەخۆشییە گواستراوەكان دەكرێت پێویستە شوێنكەوتووانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێشەنگ بن لەجێبەجێكردنی خاڵ

[1] سورة الأنفال الآية ٢٥.

بەخاڵی ئەو ئامۆژگاری و ڕێوشوێنانەی پسپۆڕان و شارەزا لە بواری تەندروستی ڕای دەگەیەنن.

ئەو پێشەنگییەش لە گوێ ڕایەڵی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی ڕەهبەرمان محمد ﷺ ەوە سەرچاوەدەگرێت.

تەماشا بکەن پێغەمبەر ﷺ هۆشیاری پێداوین و دەفەرمووێ :

﴿ إذَا سمِعْتُمْ بالطَّاعُونَ في أرْضٍ، فَلاَ تَدْخُلُوهَا، وَإذَا وقَعَ بِأرْضٍ، وَأنْتمْ بهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا مِنْهَا﴾[1] .

واتە : ئەگەر بیستان نەخۆشییەکی کوشندە لە خاکێکدا بڵاوبۆتەوە مەچنە ئەوێ وە ئەگەر ، لە خاکی ئێوەدا ئەو نەخوشییە کوشندەیە پەیدابوو دەرمەچن لێی بەڵام ، ئەم ڕاگەیاندنە دەبێ لەڕێی کەسانێکی شارەزاوە ڕابگەیەنرێت نەك خەڵکانێك هیچ پسپۆرییەکیان نەبێ لە بواری تەندروستیدا .

تێڕوانینی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ نەخۆشییە گواستراوەکان لەو سەردەمەی پێغەمبەردا ﷺ پێمان دەڵێت : ساغ و سەلامەتی ژیانی مرۆڤەکان کرۆکی ئامانجە خودایییەکانە ﴿مقاصد الشريعة﴾ یە.

بریتین : لە پاراستنی بەرژەوەندییە پێویستییەکان ﴿الضروريات الخمس﴾ ئەویش ﴿ پاراستنی ئاین و ، نەفس و، ناموس و،سامان و، ژیریی﴾[2].

ئەوەی مەبەستمانە ئاماژەی پێبکەین پاراستنی گیانە(حفظ النفس) ، لە پێناو مانەوەی ژیان و بەردەوامبوونی دەبێت کەمتەرخەمی ودرێغی نەکەین لە دەست گرتن بە هۆکاری خۆپاراستن و خۆپارێزییەوە بۆ نموونە :

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٧٢٨ ج١٠ ص ٢٢٠ .
[2] الموافقات / الشاطبي / ج٢ ص ٨ .

گرنگیدان بە تەندروستی جەستەمان لە ڕووی خواردنی پاك و چۆنیەتی دوور كەوتنەوە لەو شوێنانەی گومانی لێدەكرێت كە تووشی پەتای كوشندە بین لێوەی هەروەها خۆپاراستن لە نەخۆشییە كوشندەكان بە چوونە لای پزیشك بە مەبەستی چارەسەركردن و وەرگرتنی عیلاج و بەكارهێنانی داوودەرمان .

هەڵبەتە (ابن القیّم)[1] :

ئاماژەی بە هەندێ حیكمەت كردووە لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ كە دەفەرمووێت :

﴿ إذَا سمِعْتُمْ بالطَّاعُونَ في أرْضٍ، فَلاَ تَدْخُلُوهَا، وَإذَا وقَعَ بِأرْضٍ، وَأنْتمْ بهَا، فَلاَ تَخْرُجُوا مِنْهَا﴾[2] .

دەڵێت : (تَجَنُّبُ الأسْبابِ المُؤذِيَةِ ، وَالبُعْدُ مِنْهَ و الأخْذُ بِالعَافِيَةِ الَّتِي هِيَ مَادَّةُ المَعَاشِ وَالمَعَاد ، ثم ألا يستنشقوا الهواء الذي قد عفن وفسد فيمرضون ، وأخيرا ألا يجاوروا المَرْضَى الَّذِينَ قَدْ مَرِضُوا بِذَلِكَ، فَيَحْصُلُ لَهُمْ بِمُجَاوَرَتِهِمْ مِنْ جِنْسِ أمْرَاضِهِمْ)[3].

واتە : خۆ بە دوور گرتن لەو هۆكارانەی دەبنە سەرچاوەی ئێش و ئازارو نەخۆشی هەروەها گرنگیدان بە ساغ و سەلامەتی جەستە یەكێكە لە بنەما سەرەكییەكانی مانەوەی ژیانی كەسەكان .

---

[1] أبُو عَبْد الله شَمْسُ الدِّينَ مُحَمَّدُ بْن أبِي بَكرِ بْنْ أيُّوبَ بِنِ سَعْدِ بْنِ جرِيزْ الزُّرْعِيْ (٦٩١هـ - ٧٥١هـ/١٢٩٢م - ١٣٥٠ م) المعروف باسم "ابنِ قَيِّمِ الجوزِيـة" أو "ابْـنِ القَيـمِ". هُـو فَقيـه ومحدّث ومفسر وعالم مسلم مجتهد وواحد مِن أبرز أئمّة المذهبَ الحنبلي في النصف الأول من القرن الثامن الهجري. نشأ ابن القيم حنبلي المذهب؛ فقد كان والده "أبو بكر بن أيوب الزرعي" قيماً على "المدرسة الجوزية الحنبلية"، ومن مصنفاته إعلام الموقعين عن رب العالمين / و إغاثة اللهفان من مصايد الشيطان / و إغاثة اللهفان في حكم طلاق الغضبان / و اقتضاء الذكر بحصول الخير ودفع الشر/ و الطاعون . الذيل على طبقات الحنابلة ج٥ ص ١٧٠ و الوسوعة الحرة .

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٧٢٨ ج١٠ ص ٢٢٠ .

[3] زاد المعاد / لابن القيم الجوزية ج٤ ص ٤٠ بتصرف .

بۆ ئەوەی تەندروستیتان باش بێت دەبێ دووربکەونەوە لە هەڵمژینی هەوای بۆگەن و ژەهراوی و شوێنەداخراوەکان هەروەها نابێ تێکەڵ بن بەو کەسانەی تووشی و ئەو نەخۆشییە گواستراوانە بوون نەبادا بە هۆی ئەوانەوە دووچاری نەخۆشییەکەیان بن .

ئا ئەمە ئەو کەرەتینەیەیە لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئێستا وڵاتەکان وەك ڕێوشوێنێك دەیگرنەبەر بۆ ئەوەی چیتر ئەو پەتا کوشندەیە تەشەنە نەکات و نەگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر .

ئەگینا بەر لە (١٤٤٠) ساڵ پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی و ئامۆژگاری هاوەڵ و شوێنکەوتووانی کردووە خۆیان پاك وخاوێن ڕابگرن .

سەرنجتان بۆ ئەو فەرموودەیە ڕادەکێشم خاتوو (عائشة) دایکی ئیمانداران خودای مەزن لێی ڕازی بێ دەیگێڕێتەوە .

ئاماژە بەوەدەکات پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

[عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبِطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ][(١)].

هەڵبەتە ئەم فەرموودەیە باس لە دە (١٠) شت دەکات هەموو مرۆڤێك دەگرێتەوە نێرو مێینە بێ جیاوازی هەمووان بەشدارن لەو شتانە ، کەمن ئەوانەی لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا دەژین حەز بکەن نینۆکیان درێژ بێ یا تووکی بن باڵیان درێژ بێ یا تووکی... یا ......هتد .

کەواتە : ئەم فەرموودەیە نەخشە و بەردی بناغەی پاك و خاوێنی بۆ مرۆڤەکان

(١) صحيح مسلم بشرح النووي .رقم الحديث261 ج٣ ص ٤٨ كتاب الطهارة - باب - خصال الفطرة .

دادەنێت ، چۆن خویان بپارێزێن لە هەندێ نەخۆشی بە هـۆی پیسـی و چـڵكنییەوە تووشی دەبن .

بـەجۆرێك ، پێغەمبـەرﷺ شـوێنكەوتووانی فێـری ئـەوە دەكـات ئـاو لـەدەم و لووتیان وەر بدەن و جومگەی پەنجەكانیان بشۆرن بە جوانی (غَسْلُ الْبَرَاجِمِ)[1] .

هەر وەكوو لە وێنەكاندا هاتووە .



لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە دەفەرمووێت :

---

[1] البراجم : هي عقـد الأصـابع ومعاطفهـا كلهـا وغسـلها سـنة مسـتقلة ليسـت بواجبـة , ويلحـق بالبراجم ما يجتمع مـن الوسـخ في معـاطف وقعـر الصـماخ فيزيلـه بالمسـح ونحـوه . انظـر / نيـل الأوطار رقم الحديث ١٣٠ ص ٨٣ .

﴿الفِطرةُ خمسٌ : الخِتانُ، والاستحدادُ، وقصُّ الشَّارِبِ، وتقليمُ الأظفارِ، ونتْفُ الآباطِ﴾[1].

واتە : پێنج شت لە فیترەتن (سروشتی پاك) بریتین :

١- لە خەتەنە کردنی نێرینە نەك (مێینە) [2].

٢- لابردنی مووی بەر .

٣- کورتکردنەوەی سمێڵ .

٤- نینۆك کردنی نێرو مێ .

٥- لابردنی تووکی بن باڵ بەهەڵکێشان بێ یا بە تاشینی بێت گرنگ ئەوەیە لابرێت .

ئەوەی شایانی ئاماژە پێکردنە لەم بابەتەماندا جەخت کردنەوەیە لە کورتکردنەوەی نینۆکەکان بە تایبەت نینۆکی پەنجەکانی دەست چونکە ، بەڕاستی سەرچاوەی نەخۆشین ئەگەر بێتۆ نینۆکەکانمان کورت نەکەینەوە هەروەکو پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێکردووە ، بە دووری نەزانن دووچاری کۆمەڵێك نەخۆشی مەترسیداردەبن.

چونکە ، ژێری نینۆکەکان بەردەوام میکرۆب دەگرێتە خۆی هەربۆیە:

پێویستە لە کاتی دەست شۆرین دا ئاگاداری پاککردنەوەی ژێری نینۆکەکان بن ئەگینا خوا نەخواستە زۆر بە ئاسانی نەخۆشی کوشندە دەگوازرێتەوە بۆ نێو

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث٥٨٩١ ج١٠ ص٤٢٨ كتاب اللباس - باب تقليم الأظافر صحيح مسلم بشرح النووي .رقم الحديث٢٥٧ ج٣ ص ٤٥ كتاب الطهارة - باب - خصال الفطرة.

[2] ختان الإناث أضراره وتحريمه في القرآن / أ.د مصطفى إبراهيم الزلمي ص٦٢.

جەستە لە ڕێی نینۆکەکانەوە بێنەوەی هەستی پێبکەن .



بەداخەوە لەم سەردەمەدا ئەم ئامۆژگارییانەی پێغەمبەر ﷺ فەرامۆشکراوەو ئیشی پێناکرێت بەجۆرێك کاتێك تەماشای هەندێك لە گەنجانمان لە کوڕان وکچان دەکەیت سەرت سوور دەمێنێت !!!! بەوەی نینۆکیان درێژ دەکەنەوە تەنانەت ڕۆژانە چەند کاتژمێرێك خەریکی ڕێك و پێك کردنین ، ئاگاداری ئەوە نین ژێری نینۆکیان پڕە لە میکرۆب نابینرێن بەچاو.



واگومان دەكەن پاك و خاوێنە هەندێك میكرۆب هەن مەترسیدارن تەنانەت بە چاویش نابینرێن و هەستیان پێناكرێت .

پزیشكێكی شارەزا لە نەخۆشییەكانی پێست بەناوی ( الدكتورة وفاء علم الدين، دكتوراه واستشاري أمراض الجلدية).

باس لە مەترسی درێژكردنی نینۆك دەكات و دەڵێت :

( برینی نینۆكی درێژ پێویستە ئەگینا دەبێتە هۆكارێكی سەرەكی بۆ چوونە ژوورەوەی بەكتریای زیان بەخش بۆ نێو جەستە لە دەرئەنجامدا دووچاری هەوكردنی نەخۆشییەكانی گەدەو ڕیخۆڵە و كۆئەندامی میزەڵدان و هەروەها هەوكردن وپەیدا بوونی زیپكە وبرین لەسەر پێستی لەش و ژەهراوی بوون)[1].

كۆی ئەمانە مەترسین لەسەر ژیانی ئەوانەی نینۆكیان درێژ دەكەن چونكە ، بێئەوەی بزانێت و هەسیتان پێبكات میكرۆبێكی زۆر لە ژێر ئەو نینۆكە درێژە خۆیان حەشارداوە لەرێی بەكارهێنانی دەستییانەوە ئەو میكرۆبانە دەچنە نێو جەستەوە كاری خۆیان ئەنجام دەدەن .

هەر بۆیە پەیڕەوكردنی ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییانەی سەروەرمان محمد ﷺ قەڵایەكی پۆلایینە لە بەرەنگاربوونەوە و بەگژدا چوونی هەموو ئەو ڤایرۆس و میكرۆبە مەترسیدارانەی هەڕەشە لە ژیانی مرۆڤەكان دەكات ڕۆژانە .

كەواتە : گرنگی دان بە تەندروستی و چۆنیەتی خۆپاراستنی كەسەكان (حفظ النفس) لە نێو كۆمەڵگە یەكێكە لە ئامانجە خوداییەكان ( مقاصد الشريعة)

---

[1] مخاطر متعددة لتطويل الأظافر / الدكتورة وفاء علم الدين، استشاري أمراض الجلدية . أنظر / موقع الكونسلتو ٠٩ يناير ٢٠١٩ .

چونکە ، لە ڕێ پاك وخاوێنی ئەو ئەندامانەی لەشەوە بەرگری جەستە زیاد دەبن ودەتوانن بەرەنگاری هەرەشەی جۆرەها ڤایرۆس و میکرۆبی کوشندە ببنەوە ئەگینا پشت گوێخستن و پابەند نەبوون بەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییانە مەترسیدارن ئەگەری تووش بوون بە نەخۆشی و پەتا وەرزییەکان زیاد دەکات .

هەر بۆیە : ئایینی پیرۆزی ئیسلام گرنگی تایبەتی بە پاك وخوێنی داوە تەنانەت لە هەموو کتێبە فیقهییەکاندا بەشێکی تایبەتی بۆ تەرخان کراوە بەناوی (باب الطهارة) بەشی پاك وخاوێنی جەستەو پۆشاك وخواردن وخواردنەوەو چۆنیەتی خۆ پاککردنەوە لە خۆ دەگرێت .

کاتێك (باب الطهارة) بەشی پاك وخاوێنی دەخوێنیتەوە لە دیدی ئایینی پیرۆزی ئیسلام گەورەیی و پیرۆزی ئەو ئایینەت بۆ ئاشکرا دەبێت.

ئاین پیرۆزی ئیسلام ڕێکخەری سیستەمی ژیانە بۆ نەوەی ئادەم لە هەموو ڕوویەکەوە، سەرنج بدەن هەر لە پێناوی تووش نەبوون و دوور کەوتنەوەو خۆپاراستن لە نەخۆشییە مەترسیدارەکان کە هەڕەشەیەکی جددین لەسەر ژیانی تاك وکۆمەڵگە جەخت لە پاك و خاوێنی کراوە بەجۆرێك لە هەندێك حاڵەتدا ئەرکە (الواجب) لەکام سیستەمی جیهان بەو وردکارییە بێجگە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا نەبێت باسی پاك وخاوێنی کراوە دوایی بەتێروتەسەلی باسی لێوە دەکەین.

**جائحة كرورنا COVID ١٩-**

بجبر فيروس كورونا الحكومات ومصادر الأخبار على تقديم أكثر النصائح دقة ومساعدة لسكان العالم، حيث أن الجميع عالميا معرض للمرض. هناك طلب كبير على المتخصصين في الرعاية الصحية، وكذلك العلماء الذين يدرسون انتقال الأوبئة وتأثيرها.

يقول خبراء مثل عالم المناعة الدكتور أنتوني فوسي والمراسل الطبي الدكتور سانجاي غوبتا :

أن النظافة والحجر الصحي الجيد، أو ممارسة العزل عن الآخرين على أمل منع انتشار الأمراض المعدية، هي أكثر الأدوات فعالية لاحتواء -COVID١٩.

هل تعرف من اقترح النظافة الجيدة والحجر الصحي خلال الوباء؟

نبي الإسلام محمد، قبل ١٣٠٠ سنة في حين أنه لم يكن أبدًا خبيرًا في المسائل المتعلقة بالأمراض الفتاكة، إلا أن محمد كان لديه نصيحة رائعة لمنع ومكافحة تطور وباء مثل فيروس كورونا.

قال محمد "إذا سمعت عن انتشار الطاعون على أرض، فلا تدخلها، ولكن إذا امتد الطاعون إلى مكان أثناء وجودك، فلا تترك ذلك المكان".

وقال أيضًا: "يجب أن تبقى الأمراض المعدية بعيدة عن الأشخاص الأصحاء".

كما شجع البشر بشدة على الالتزام بممارسات النظافة التي من شأنها أن تبقي الناس في مأمن من العدوى.

## چۆنیەتی خواردن لە دیدی ئیسلام

ئایینی پیرۆزی ئیسلام سیستەمە وەکو ئاماژەمان پێدا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا یاساو ڕیسای خۆی هەیە لە چ دەستوورو پرۆگرامێکی تری دونیا بەهەمان شێوازی ئیسلام ڕێنمایی پەیڕەوکارانی خۆیکردووە بۆ نموونە :

خودای مەزن دەفەرموویت : ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ ﴾[١].

سەرنج بدەن خودای مەزن لەو ئایەتەدا یاساو سنوورێکی بۆ نەوەی ئادەم داناوە بۆ چۆنیەتی خواردن وخواردنەوە حەڵاڵ وپاك وسوود بەخشەکان .

[١] سورة الأعراف الآية ٣١ .

گەر هاتوو ئەو سیستەم وسنوورەى بەزانـد ئەوا دەچێتە ریزى زیادەڕەوییەكانەوە(المسرفين) خوداش ئەو جۆرە كەسانەى خۆش ناوێت كە زیادەڕەوى دەكەن .

بێگومان ئەم سیستەمەى خوداى مەزن لە بەرژەوندى تەندروستى مرۆڤەكانە تەماشا بكەن زۆرى ئەو نەخۆشییانەى دووچارى دەبن لە فشارى خوێن و شەكرەو زۆرى ڕێژەى كولیسترۆڵ وجەلتەى دڵ و مێشك و ..و..و .. هتد. هۆكارەكەى بەزاندنى ئەو سنوورەى خودایە بۆى كێشاوین .

هەرچى پزیشك و پسپۆرو شارەزا هەن لە بوارى تەندروستى كۆكن سەبارەت بەوەى زۆر خواردن هۆكارى سەرەكى ئەو نەخۆشییانە ، خۆ هۆكارى تریش هەن وەكوو تێكچوونى بارى دەروونى و دڵە ڕاوكێ و ڕەشبینى ... هتد .

بەڵام ئەو زیادەڕەوییە لە خواردن ، كێشە سەرەكییەكەیە سەرنج بدەن پێغەمبەر ﷺ چى دەفەرمووێت :

﴿ ما ملأ ابنُ آدمَ وعاءً شرًا من بطنِه حسْبُ ابنِ آدمَ أكلاتٌ يُقمْنَ صلبَه فإن كان لا محالة فثُلثٌ لطعامه وثلثٌ لشرابِه وثلثٌ لنفسه﴾[1].

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ پێمان دەفەرمووێت : ئەى نەوەى ئادەم ئەوەندە بخۆن تاكوو بتوانن جموجۆڵ بكەن ئەگەر ، بڕیارى ئەوەتان داوە هەربخۆن گەدەتان بكەنە سێ بەشەوە بەشێك بۆ خواردن ، بەشێك بۆ ئاو خوارنەوە ئەوى تریان بۆ هەناسەدان

[1] سنن الترمذي / رقم الحديث ٢٣٨٠ ص٥٣٥ باب- ماجاء في كراهة كثرة الأكل , حديث صحيح .



پشتگوێ خستن و فەرامۆش کردنی ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییەی سەروەرمان محمد ﷺ یەکسانە بە تووش بوون بە هەندێ نەخۆشی چاوەڕوان نەکراو.

## شێوازی خواردن

لە بارەی چۆنیەتی نان خواردنەوە تەماشا بکەن پێغەمبەر ﷺ بە چ شێوازێك چۆنیەتی خورادن فێری ئەو گەنجە دەکات لەسەر سفرەی خواردنەکەی دانیشتووە ناوی گەنجەکە (عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ) دەڵێت :

﴿كُنْتُ غُلاَمًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : يَا غُلاَمُ ، سَمِّ اللّهَ ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ﴾[1].

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري / رقم الحديث ٥٣٧٦ ج٩ ص ٦٤٥ كتاب الأطعمة - باب التسمية على الطعام والأكل باليمين.



ئـەوەی گرنگـە بـە لامانـەوە لـەم فەرموودەیـەدا ئامـاژەی پێبکـەین چـەند هەنگاوێکە لەسەرەتای دەست کردن بەخواردن گرنگە ڕەچاو بکرێت .

یەکەمیان : بەناوی خودا دەست پێبکەن تەماشا بکەن پێغەمبەرﷺ چی بەو گەنجەدەفەرمووێت :

بەناوی خوا (بسم الله) دەست پێ بکـە ئـەو کاتـەی خـواردن دەخۆیـت یـا هـەر کارێکی تر ئەکەن گرنگ ئەوەیە بە (بسم الله) دەست پێبکەن.



سەرنجتان بۆ چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ ڕادەکێشم دەفەرموێت:

﴿ كلُّ أمرٍ ذي بالٍ لا يبدأ فيهِ ببسمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيمِ فَهوَ أقطعُ﴾[1].

واتە : هەر کردەوەیەکتان بەبێ ناو هێنانی خودا(بسم الله) دەست پێکرد ، دڵنیابن ئەو کردەوەیەتان کەم وکور دەبێت و هیچ خێرو بێرێکی لێ بەدەست ناهێت.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فێری شوێنکەوتووانی دەکات بەیانیان و ئێواران ئەو زیکرە بکەنە ویردی ڕۆژانەیان تاوەکوو، لە هەموو بەڵاوناخۆشییەکی کتوپڕی ژیان بەدوور بن .

بەیانیان کە ڕۆژ دەبێتەوە ، هەروەها ئێواران کاتێك شەو دادێت بەڕاستی ئەو ویردە هێزێکی ڕوحییە خودای مەزن بە ئیمانداارانی بەخشیوە زۆر گرنگە هەموو ڕۆژێك بخوێنرێت.

تەماشا بکەن ڕەهبەرمان محمد ﷺ لەم بارەیەوە چی دەفەرموێت :

﴿ مَن قال: بسمِ اللهِ الذي لا يَضرُ مع اسمِه شيءٌ في الأرضِ ولا في السماءِ وهو السميعُ العليمِ ثلاثَ مرات ، لم تصبْه فجأةُ بلاء حتى يُصبحَ ، ومَن قالها حينَ يُصبحُ ثلاثَ مرات لم تُصبْه فجأةُ بلاءِ حتى يُمسي﴾[2].

حەزرەتی (عثمان بن عفان) خودا لێ ڕازی بێ دەفەرموێت : بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو فەرمووی :

( هەر کەسێك سێ جار ئەو زیکرە بخوێنێت بێگومان لەگەڵ ناوی زاتی ﴿الله﴾

---

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٤٨٤١ ص ٢٢٢٩ حديث حسن .

[2] عون المعبود شرح سنن أبي داود رقم الحديث ٥٠٨٨ ص ٢٣١٨ كتاب الادب / و سنن الترمذي رقم الحديث ٣٣٨٨ ص ٧٦٩ اللفظ لأبي داود , حديث حسن صحيح .

شتێك نیە زیانی پێببەخشێت جا ئەو شتە لە زەویدا بێ یاخود لە ئاسماندا بێ .

ئەو كەسەی ئەو فەرموودەیەی گێراوەتەوە دەڵێت (أبان) كوڕی حەزرەتی عوسمان لایەكی شەلەل (ئیفلیج) بوو تەماشایەكیم كرد(أبان) پێی وتم وا گومان نەكەیت درۆم كردبێ لە گێڕانەوەی ئەو فەرموودەیە ، باوكیشم درۆی هەڵنەبەستاوە بە ناوی پێغەمبەرەوە بەڵكو ، ئەوە منم لە یادم چوو ئەو ویردە بكەم ئەگینا ئیفلیج نەدەبووم)[1] .

أخرج أبو داود في سننه وصححه الألباني عن عثمان – رضي الله عنه – أنه سمع النبي – صلى الله عليه وسلم قال -: (( «مَنْ قَالَ بِسْمِ اللَّهِ الَّذِى لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَىْءٌ فِى الأَرْضِ وَلاَ فِى السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُصْبِحَ وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ ثَلاَثُ مَرَّاتٍ لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُمْسِىَ)). قَالَ فَأَصَابَ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ الْفَالِجُ فَجَعَلَ الرَّجُلُ الَّذِى سَمِعَ مِنْهُ الْحَدِيثَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ فَقَالَ لَهُ مَا لَكَ تَنْظُرُ إِلَىَّ فَوَاللَّهِ مَا كَذَبْتُ عَلَى عُثْمَانَ وَلاَ كَذَبَ عُثْمَانُ عَلَى النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- وَلَكِنَّ الْيَوْمَ الَّذِى أَصَابَنِى فِيهِ مَا أَصَابَنِى غَضِبْتُ فَنَسِيتُ أَنْ أَقُولَهَا. ورواه الترمذي في سننه بلفظ: ((مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لم يَضُرَّهُ شَيْءٌ)).»

**قال الإمام القرطبي : ( هذا خبر صحيح وقول صادق علمنا دليله دليلًا وتجربة فإني منذ سمعته عملت به فلم يضرني شيء إلى أن تركته فلدغتني عقرب بالمدينة ليلًا فتفكرت فإذا أنا قد نسيت أن أتعوذ بتلك الكلمات)[2].**

**الإمام القرطبي** (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) پشت ڕاستی ئەو فەرموودەیە دەكاتەوە و دەڵێت : لەو ڕۆژەوەی ئەو فەرموودەیەم بەر گوێ كەوتووە كارم پێكردووە ڕۆژانە

---

[1] سنن ابي داود / وەرگێڕانی : ناصح إبراهيم سازاني/ رقم الحديث ٥٠٨٨ ج٥ ص ٦١٥ حديث صحيح.

[2] الفتوحات الربانية على الأذكار النواوية : محمد علي محمد بن علان ج٣ ص ٧٧ .

دەیخوێنم تووشی هیچ زیانێك نەبووم لەو ماوەیە بەڵام ، ڕۆژێك دووپشك پێوەی دام هۆکارەکەیم زانی ئەو ڕۆژە لە یادم چووبوو بیخوێنم .

کەواتە : ئەو هێزە ڕوحییە بۆ کەسی باوەڕدارلە شوێنکەوتووانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام پێویست و گرنگە.

هەڵبەتە ئەو موسڵمانەی ئەو ویردە دەخوێنێت ڕۆژانە وەکوو ، ئاماژەمان پێکرد (هێزی ڕوحی) پێدەبەخشێت لە دەرئەنجامدا متمانەیەکی وای لا دروست دەکات بە جۆرێك تووشی هیچ شتێك نابێت بە بێ ئیزن و فەرمانی خودای مەزن بەڵام ، ئەگەر هاتوو تووشی شتێکیش بوو ئەوا بە ئاسانی لەسەری دەروات و لێی دەرباز دەبێت.

کەواتە : ئەو شتانەی تووشی دەبین ، دەبێت فەرمانی خودای لەسەر بێت .

لەدەرئەنجامی ئەم متمانە بوونە مرۆڤی باوەڕدار هیچ ترس و دڵە ڕاوکێیەك ڕووی تێناکات و بەرگری جەستەی بەهێز دەبێت بەرامبەر بە هەموو پەتایەك ئەگەر چی ، ئەم متمانە بوونە ، لە زانستی پزیشکی پێی دەڵێن بەهێزبوونی بەرگری جەستە (المناعة).

## (ابن سینای زانا و پزیشك)[1]




**چی دەڵێت :** (الوهم نصف الداء، والاطمئنان نصف الدواء، والصبر أول خطوات الشفاء)[2].

---

[1] لعلامة الشهير الفيلسوف ، أبو علي ، الحسين بن عبد الله بن الحسن بن علي بن سينا ، البلخي ثم البخاري ، ولد في قرية أفشنة بالقرب من بخارى (في أوزبكستان حالياً) من أب من مدينة بلخ (في أفغانستان حالياً) وأم قروية. ولد سنة ٣٧٠ هـ (٩٨٠م) صاحب التصانيف في الطب والفلسفة والمنطق من مؤلفاته الإنصاف " عشرون مجلدا ، " البر والإثم " مجلدان ، " الشفاء " ، ثمانية عشر مجلدا ، " القانون " مجلدات " الإرصاد " مجلد ، " النجاة " ثلاثة مجلدات ، " الإشارات " مجلد ، " القولنج " مجلد ، " اللغة " عشر مجلدات ، " أدوية القلب " مجلد ، " الموجز " مجلد ، " المعاد " مجلد ، وأشياء كثيرة ورسائل , وتوفي في همدان (في إيران حاليا) يوم الجمعة في رمضان سنة ثمان وعشرين وأربعمائة .انظر سير أعلام النبلاء ج ١٧ص ٥٣١ تسلسل ٣٥٦ و الموسوعة الحرة .

[2] قصة العلوم الطبية في الحضارة الإسلامية / ص ٧٠-٧١ / و حدائق الحكمة أقوال مأثورة من مدرسة الحياة / ص٢١.

واتە : نەخۆشی نیوەی لە (وەهم )ە تـرس و دڵـەڕاوکێ وەیـە ، دڵنیاکردنـەوە (الإطمئنان) نیوەی چارەسەرکردنە.

واتە : جێی داوودەرمـان دەگرێتـەوە ئەوەشـتان لـە یادبێـت یەکـەم هـەنگاوی چاکبوونەوە ئارامی و خۆ ڕاگرییە(الصبر).

ئەم وتەیەی (إبن سینا) یاساو ڕێسایە لە زانستی پزیشکیدا چـونکە ، تـرس و وەهم وا لە مـرۆڤ دەکـات نـەخۆش بکـەوێت لەبـەر ئـەوەی تـرس بـەرگری جەسـتە (المناعة) دائەگرێت مرۆڤ توانای بەرهەڵستکردنی نەخۆشییەکەی نامێنێت .

زۆر گرنگـە پزیشـکی پسـپۆر نـەخۆش دڵنیـا بکاتـەوە لـە نەخۆشـییەکی وای لێبکات ورەی بەرز بکات وئومێدو هیوای چاکبوونەوەی بـۆ بخوازێـت بـە زووتـرین کات .

سەرنج بـدەن چـی بکرێـت کاتێـك سـەردانی کەسـێکی نـەخۆش دەکـەن دیـارە ڕەهبەرمان محمد ﷺ ئەو پرسەی بۆ یەکلایی کردووینەتەوە دەفەرمووێت :

﴿إِذَا دَخَلْتُمْ عَلَى الْمَرِيضِ، فَنَفِّسُوا لَهُ فِي الْأَجَلِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لَا يَرُدُّ شَيْئًا، وَهُوَ يُطَيِّبُ نَفْسَ الْمَرِيضِ﴾[1].

واتە : ئەگەر سەردانی نەخۆشێکتان کرد کارێکی وابکەن ئومێدو هیوای تەمەن درێژی و چاکبوونەوەی بۆ بخوازن ئەگەر چی ئەوەی خودا نووسیبێتی هەر ئەوە دەبێ بەڵام ئەو قسانەتان ئاهێك بۆ کەسە نەخۆشەکە دەگەڕێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی فەرموودەکە (ضَعيفٌ) بێ هێزە حوکمی شەرعی لێوەرناگیرێـت بـۆ پابەند بوون بە فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خودا.

---

[1] سنن الترمذي رقم الحديث ٢٠٨٧ ص ٤٧١ حديث ضعيف جدا .

بەڵام ، واتاکەی زۆر تەواوە هەر بۆ دڵنەوایی کردنی نەخۆشی سەر جێگاکان خراپ نیە بەو شێوازە دڵیان خۆش بکرێت ورەیان بەرزبکرێتەوە چونکە هەندێك نەخۆش هەن بە هەڵامەتێك دەروخێن و بێ ئومێدی باڵ دەکێشێت بە سەریاندا ، هەروەها سوننەتە تا بۆتان دەکرێت ماوەی سەردانتان بۆ لای کەسی نەخۆش درێژە نەکێشێ نەبادا پێویستی تایبەتی هەبێ شەرم بیگرێ لەبەر حوزوری ئێوە نەتوانی جێبەجێی بکات .

**دان براون Dan Brown)** [1]:



**دەڵێت:(ثمة عدوى واحدة تنتشر أسرع من الفيروس ألا وهي الخوف)[2].**

**ئـەم رۆمـان نووسـە دەڵێـت : تـرس لـە ڤـایرۆس ترسـناكتر و خێراتـرە لـە بڵاوبوونەوەیەدا ، بەڕاستی دەستی خستۆتە سەر برینەكە زۆری ئەوانـەی نـەخۆش دەكەون لەسەدا پەنجای نەخۆشییەكانیان دەروونییە.**

---

[1] دان براون (Dan Brown) (مواليد ٢٢ يونيو ١٩٦٤ في ايكسيتر، نيوهامشير، الولايات المتحدة الأمريكية) مؤلف أمريكي لقصص الخيال والإثارة الممزوجة بطابع علمي وفلسفي حديث بأسلوب مشوق مكّنه من تحقيق أفضل المبيعات. حققت رواياته رواجاً كبيراً بين الأجيال الشابة في أمريكا وأوروبا، ألف دان براون العديد من القصص والروايات: الحصن الرقمي ، حقيقة الخديعة ، ملائكة وشياطين ، الرمز المفقود ، شيفرة دا فينشي ، الجحيم وأخيراً رواية أصل (origin) نجحت روايات دان بروان للوصول إلى السينما، وأنتجت عدة أفلام سينمائية عن رواباته، وهي: فيلم شيفرة دافنشي، وتلاه فيلم ملائكة وشياطين ، و فيلم " الجحيم" المأخوذ من نفس الرواية وقامت شركة كولومبيا السينمائية بالشروع بإنتاج فيلم مقتبس من رواية الرمز المفقود جميعهم من بطولة الفنان توم هانكس..

[2] رواية الجحيم / الروائي دان براون - ص٣٣٨.

واتە: دارمـاون لەترسـی دەرهاویشـتەی جۆری نەخۆشییەکە بۆیـە پێویسـتە ئیمانداران پەروەردە بکرێن لەسەر ئەوجۆرە ویردو زیکرانەی پێیان دەوترێت قـەڵای موسـڵمانن چـونکەدەیانپارێزێت لـە هـەموو جـۆرە تـرس و دڵـە ڕاوکێیـەك ئینجـا هەرچی هۆکار هەن بەکاری بهێنن بۆ چارەسەرکردنی ئـەو گیروگرفـت وکێشـانەی تووشیان دەبێت.

کەواتە : ئـاییـنی پـیرۆزی ئیسـلام دوو ڕێگـای دانـاوە بـۆ شـوێنکەوتووانی بـۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو گیروگرفت و کێشـەو نەخۆشییەیانەی تووشی دەبن .

یەکەم :

هێزی ڕوحی لە جێبەجێکردنی زیکرو ویردەکانی ڕۆژانەوە بەدەست دێنێت .

دووەم :

هێزی خۆگرتنە(الأخذ بالأسـباب) بـەو هۆکـارو ئامرازانـەی دەبنـە مایـەی کـەم کردنەوەی کاریگەری ئەو نەخۆشی و گیرو گرفتانەی دووچاری بوون.

دووەمیان : ﴿وَكُلْ بِيَمِينِكَ﴾ بە دەستی ڕاست بخۆ .

هەڵبەتە هەرچی کاروپیشە هەن زۆربەی بەدەستەکان جێبەجێ دەکرێن ڕاسـت و چەپ بەڵام ، بۆ هەندێ پێداویستی دەستی چەپە بەکاردەهێنرێت

حەزرەتی (عائشة) خودا لێی ڕازی بێ دەفەرمێ :

﴿كانَ النبيّ صَلّى اللهُ عليه وسلّمَ يُعْجِبُهُ التّيَمّنُ، في تَنَعّلِهِ، وتَرَجُّلِهِ، وطُهُورِهِ، وفي شَأنِهِ كُلّه﴾[1].

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ١٦٨ ج١ ص٣٥٣ كتاب الوضوء -باب-

ئەم فەرموودەیە پێمان دەڵێت پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ شت دا حەزی بەوە دەكرد لای ڕاستی بەكاربێنێت (قاچی بێت یا دەستی) لەوانە :

دەست نوێژ گرتن لە پێشدا قۆڵی لای ڕاستی دەشۆری و لە داهێنانی قژی لای ڕاستەوە دەستی بەقژ داهێنان دەكرد بۆ لە پێ كردنی نەعلیش لای ڕاستەی لە پێ دەكرد.

بێگومان بەكارهێنانی دەستی ڕاست دەلالەتی خۆی هەیە تەماشا بكەن خودای مەزن چی دەفەرمووێت :

﴿ يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَأُولَئِكَ يَقْرَأُونَ كِتَابَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلاً ﴾[1].

هەروەها لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێ : ﴿ وَنَادَيْنَاهُ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ الْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيّاً ﴾[2].

سەرنجتان بۆ توێژینەوەیەكی زانستی لەبارەی بەكارهێنانی لای ڕاست (التیامن) ڕادەكێشم نووسینی (د محمد سقا عید)[3]:

---

التيمن في الوضوء والغسْلِ .

[1] سورة الإسراء الآية ٧١ .

[2] سورة مريم الآية ٥٢ .

[3] الدكتور محمد السقا عيد ، من مواليد دمياط عام ١٩٦٣م، تخرج في كلية طب الزقازيق عام ١٩٨٧ م، وحصل على الماجستير في طب وجراحة العيون، ويعمل حاليا كاستشاري لطب وجراحة العيون، تتركز كتاباته عن المفاهيم الطبية والعلمية لمعطيات القرآن والسنة، وشارك بالكثير من الكتابات في مجاله بوسائل الإعلام العربية المختلفة، وهو عضو بارز في العديد من المجامع العلمية، وأضاف للمكتبة العربية والإسلامية العديد من الموسوعات والكتب والكتيبات العلمية في مجاله.. أنظر : شبكة الألوكة / موقع د. محمد السقا عيد / السيرة الذاتية .
ملاحظة للراغبين بمتابعة البحث بكامله مراجعة الموقع * a.net00www.



**نظام التيامن في الجسم البشري:**

**( ثبت علمياً أن كل حركة في جسم الإنسان تدور حسب نظام دقيق، بحيث تبدأ الحركات من** الجهة اليمنى إلى الجهة اليسرى ، **ثم تتلاشى وتنتهي ..**

**من ذلك : حركة الدم التي تبدأ أول نقطة فيها داخل جهاز الدورة الدموية من القلب، عندما تتقلص العضلات القلبية، لتضخ الكتلة الدموية، فيبدأ سير الدم النقي من تجاويف البطين إلى الشريان الأبهر الذي يتجه بشكل مقوس من** الجهة اليمنى إلى الجهة اليسرى، **بحيث يجعل جريان الدم سائراً بهذا الاتجاه، مبتدئاً** من اليمين ومنتهياً في اليسار، **بعد أن تتشعب الأوعية الدموية من الدقيق إلى الأدق، حتى تتلاشى حركة الدم، وتصبح غير منظورة لا تبصرها العين إلا بمساعدة العدسات المجهرية المكبرة، حيث تشاهد حركة الكريات الدموية وهي تؤدي وظائفها في تغذية وإرواء الأنسجة بمساعدة السوائل الدموية.**

**حركة الأمعاء تبدأ من باب المعدة الاثنى عشر بحيث** يكون اتجاه الحركة للمواد الغذائية من الجهة اليمنى ، ثم تنعطف الحركة باتجاه اليسار .. **وإلى أنحاء منطقة الامتصاص الشعرية في الأمعاء الدقيقة.**

**حركة القولون في منطقة الأمعاء الغليظة، تبدأ** من نقطة الجهة اليمنى باتجاه الناحية اليسرى **إذ تتقلص لدفع المواد المتبقية من عملية الامتصاص إلى الجهة اليسرى المقابلة بعد أن تجمعت في الخزان الأعور الكبير،** فتتحرك المواد من الجهة اليمنى إلى اليسار .. **وإلى القولون المستعرض المتوازي وهكذا.**

**حركة التنبيهات العصبية العجيبة الصنع في المراكز العصبية، والأسلاك الحسية والحركية المتصلة بها،** تبدأ دورتها من الجهة اليمنى، وتنتهي في الطرف الأيسر **عند أداء وظائفها الطبيعية الفسيولوجية.**

وهكذا أظهر الحديث الشريف تلك الظاهرة العلمية في الكيان البشري، مما جعلها انطلاقة علمية لم تكتشف إلا بعد بضعة قرون من قول الرسول صلى الله عليه وسلم ( الإعجاز العلمي في الإسلام - السنة النبوية للأستاذ : محمد كامل عبد الصمد).

وكما نعلم فان المخ ينقسم إلى قسمين أيمن وأيسر والجزء الأيمن منه مسؤول عن الحركات الصادرة من الجزء الأيسر في الجسم كذلك الجزء الأيسر من المخ هو المسؤول عن الحركات الصادرة من الجزء الأيمن من الجسم.

وقد اكتشف الأطباء مؤخراً أن الجزء المسؤول عن العنف والشر في الإنسان يقع في الجزء الأيمن من المخ وأن استخدام الجزء الأيسر من الجسم يقوي دافع العنف والشر الموجود مركزه في الجزء الأيمن من المخ .

لذا نجد العبرة و الجواب الشافي فيما أمرنا به رسولنا الكريم (محمد صلى الله عليه وسلم) قبل١٤٠٠ سنة ويزيد حينما قال: [ تيمنوا فإن في اليمن بركة]...

**بەڵام ، ئەمە بەو مانایە نیە ئەوەی دەستی چەپی بەكار بهێنێ بۆ نان خواردن یا ئیش كردن تاوانێكی كردووە وگوناهبارە چونكە ، كەسانێك هەن چەپەوانەن لەوەتەی لە سكی دایكیانەوە هاتوونەتە دونیاوە هەر ، چەپەوانە بوون ئەمانە زەحمەتە بتوانن بە ڕاستەیان كارەكانیان ڕابپەڕێنن.**

**بەڵام ، گەر هاتوو بەڕاهێنان خۆیان فێری ئەوەكرد بە ڕاستەیان كارەكانیان بكەن هەر لە پێناو چاوكردن لە پێغەمبەر و ﷺ جێبەجێ كردنی سوننەتەكەی بێگومان ئەو كەسانە پاداشتیان هەیە لای خودای باڵادەست كە بریتیە لە :**

**١- بەدەستهێنانی خۆشەویستی خودا.**

**٢- لێخۆش بوون وسڕینەوەی ئەو گوناهانەی ئەنجامتان داون .**

بڕوانن خودای میهرەبان لەو بارەیەوە چی فەرمووە :

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1].

---

[1] سورة آل عمران الآية ٣١.

سێهەمیان : ﴿وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ﴾ لە بەردەمی خۆتەوە بخۆ .

پێمان باشە لە سەر ئەم خاڵەیان هەڵوەستەیەك بكەین زۆرێك لـە خانـەوادەكان لە ناو شارو لادێ و هۆزەكاندا تـا وەكـو ئێسـتاش لـە ماڵـەوەیان قـاپێكی گـەورە دەهێنن خواردنەكەی تێدەكەن هەموو ئەندامانی ئەو خانەوادەیـە دەسـتیان دەخنـە نێو قاپەكەوە دەست بەخواردن دەكەن ئەمە لە كاتێكدا شتێكی زۆر باشە.

بەڵام لە لایەنی تەندروستییەوە باش نیە بەڵكو ، لەوەیە زیان بەخش بێت ئێوە سەرنج بدەنە فەرمووده‌كەی پێغەمبەر ﷺ چی دەفەرمووێت :

﴿وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ﴾ لەسەردەمی خۆیدا كەوچك نەبوو خواردنی پێ بخورێت بە دەست نانیان دەخوارد هەروەها قاپی خواردنیش هەركەم بووە لەوەیە لە ماڵێكدا هەر یەك قاپ هەبوو بێت هەر بۆیە :

ئەو گەنجە لە كاتی نان خواردنەكەیدا لەگەڵ پێغەمبـەر ﷺ دەسـتی بـە هـەموو لایەكدا دەبرد ئا لەو ساتەدا پێغەمبەر ﷺ هۆشداری پێدەدات پێـی دەفـەرمووێت : ڕاوەستە ئەی گەنج خەریكە هێڵـی سـوور دەبـەزێنیت ، دەبێـت هـەر لای خۆتـەوە بخۆیت .



لێرەدا جێی خۆیەتی خوێندنەوەیەك بۆ ئەو ئاگادار كردنەوەی ئەو گەنجە بكەین لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ پرسیاری ئەوە بكەین ئایا هۆكارەكەی چی بوو ؟؟ لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێین (الله أعلم):

لەوەیە : لە كاتی دەست بردن بۆ لاكەی تر خواردنەكە دەستی بەدەمییەوە بووە بەشێك لە خواردنەكەو لیكی دەمی بەدەستییەوە ماوە ئەوا جارێكی تر خواردنەكەو لیكەكە بەر ئەو لایەی تری خواردنەكە دەكەوێت ئا ئەوە كێشەكەكەیە.

گریمان ئەو كەسە نەخۆشە ئەوا ئەو نەخۆشییە گواسترایەوە بۆ نێو خواردنەكە ، یاخود بەرامبەرەكەی دڵی تێك دەچێت و دەشێوێت كاتێك دەست بۆ لای ئەوەوە دەبات ، ڕەچاوو پەیڕەوكردنی ئەو خاڵە گرنگە ﴿وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ﴾.

پێویستە هەركەسە لە بەردەمی خۆیەوە نان بخوات كاتێك لەگەڵ كەسانی تر نان دەخوات نابێت دەست بۆ لاكەی بەرامبەری بەرێت .

هەڵبەتە ئەو ڕێنماییە هەموو كەسێك دەگرێتەوە تەنها تایبەت نیە بەو گەنجە زۆر گرنگە كاتێك لە گەڵ كەسانی تر نان دەخۆین ئەو ئامۆژگارییەی

پێغەمبەرﷺ لە بیر نەکەین بەڵکو ، دەبێت کاری لەسەر بکەین بۆیە پێویستە لەمەو دوا لەسەر خوانەکان هەرکەسە قاپی تایبەتی خۆی هەبێت بە جۆرێك قاپێك بۆ برنجەکەی وە قاپێك بۆ شلەکەی



چونکە ئەو ساتە من دڵنیا دەبم بەرامبەرەکەم لە قاپەکانی بەردەم خۆی کە بۆی داندراوە نان دەخوات هیچ شتێکی تێکەڵ بە خواردنەکەی من نابێت .

ئا بەو جۆرە دەتوانرێت خۆ پارێزیەکی زۆر باش بکرێت لەو نەخۆشییە گواستراوانەی کە زووبەزوو بڵاو دەبنەوە لەڕێی خواردن وخواردنەوە ، ئایا گوێبیستی ئەوە نەبوون زۆرێك لە پزیشکەکان ڕێنمایی دەدەن بە خانەوادەی ئەوانەی نەخۆشیان هەیە دەبێت خواردن وخواردنەوەی جیا بکرێتەوە تا وەکوو کەسانی تر لەو خانەوەدایە تووشی نەخۆشییەکەی نەبن .



لە لایەکی ترەوە تەماشا بکەن پێغەمبەر ﷺ چۆن ئامۆژگاری شوێنکەوتووانی دەکات بە تایبەت کاتێك لێدەبنەوە لە خواردن سەرنج بدەن چی دەفەرموویت:

﴿من بات وفي يدهِ ريح (غمرٌ)[1] ولم يغسلْهُ فأصابه شيءٌ ، فلا يلومنَّ إلَّا نفسَه﴾.[2]




پەیامی سەروەرمان ﷺ لەو فەرموودەیە بریتیە :

---

[1] غَمِرَتْ يَدُهُ : ريح اللحم وما يعلق باليد من دسمه . لسان العرب مادة غمر ج ١٠ ص١١٩ .

[2] سنن الترمذي رقم الحديث ١٨٦٠ص٤٢٧ باب كراهية البيتوتة وفي يده غمر - حديث حسن اللفظ له / وابن ماجه رقم الحديث ٣٢٩٧ ج٤ ص ٤٢٤ .

دوای ئەوەی لێبوونەوە لە نان خواردن هەر زوو بەزوو دوا مەکەون ودەستەکانتان بشۆرن مەهێڵن ئاسەواری خواردنەکەی پێوە بمێنێت.




چونكە دوور نیە مانەوەی چەوری خواردنەکانتان هۆکار بێت بۆ کۆ بوونەوەی میکرۆب لەسەر دەستەکانتان ئێوە هەستی پێناکەن لە دەرئەنجامدا تووشی نەخۆشی دەبن لێوەی ئا لەو ساتەدا لۆمەی خۆتان بکەن چونکە ، هەر خۆتان هۆکاری ئەو هەوکردن و نەخۆشییەن کە تووشی هاتوون .

هەر بۆیە زۆر گرنگە دایکان و باوکان و سەرپەرشتیاران ئامۆژگاری سەرجەم نەوەی داهاتوو بکەن لەسەر هەڵبژاردن و دیاری کردنی جۆری ئەو خواردنەی دەیخۆن وناستی پاك و خاوێنی و چۆنیەتی دەست شۆرین و لە پێش نان خواردن و پاش نان خواردن وئاگادار کردنەوەیان لە مەترسی فەرامۆش کردن و پشتگوێ خستنی ئەو ئامۆژگارییانەی پێغەمبەر ﷺ چ کارەساتێك لەدوای خۆی دێنی بە دووچار بوونی کۆمەڵێك نەخۆشی بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە .




سەرنج بدەن خودا چی دەفەرمووێت :

﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾[1] .

واتە : ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی هێناون و فەرمانی پێکردوون وەریبگرن و جێبەجێی بکەن وە ئەوانەی قەدەغەی کردوون وازی لێ بهێنن و دوور بکەونەوە لێی .

بۆ نموونە : لەم سەردەمەی ئێستاماندا بەداخەوە نەخۆشی کۆرۆنا لە تەشەنە سەندن دایە لە نێو کۆمەڵگەکەماندا سەرپێچییەکی زۆر دەکرێت بەجۆرێك بەرکەوتن و تێکەڵاوی لە شوێنە گشتییەکان و بەکارنەهێنانی دەستکێش ودەمامك و دوورکەوتنەوە بە مەودای دوو مەتر لە یەکتر زۆر باوە

[1] سورة الحشر الاية ٧ .






بەتايبەت لە نێو موسڵمانانداا پابەند نەبوون بە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی پزیشك و پسپۆران و شارەزایانی بواری تەندروستی بەدی دەکرێت.

بەجۆرێك ئەم پابەند نەبوون و گوێنەدانە شۆڕ بۆتەوە بۆ نێو هەندێك لە مامۆستایانی ئایینی بەردەوام مزگەوتەکانیان بەڕووی موسڵمانان دا کردۆتەوە جومعەو جەماعەتیان بۆ دەکەن .



هەروەکو ئەوەی ئەم پەتا کوشـندەیە بـوونی نـەبێت ، خـۆ دەبـوو ئـەوان پێشـەنگ بوونایە لە جێبەجێکردن و پەیڕەوکردنی ئەو ئامۆژگاری ڕێنماییە تەندروسـتییەکان هەر لەبەر ئەوەی دینەکەمان وامان پێ دەڵێت و ئاراستەمان سەرنج بدەن خودا چی دەفەرموویت : ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ [1].

واتە : گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودای مەزن و پێغەمبەر بن ﷺ .

خودای گەورە دەفەرمووێ : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾[2].

پـەیامی خـودای مـەزن بـۆ ئیمانـداران بریتیـە لـەوەی دەبـێ بـە ئاگـا بـن و بەردەوامیش لە ئامادەباشیدا بن بەرامبەر بە دوژمن  و نەیارانیان .

دیارە دوو جۆرە دوژمن هـەن بەرامبـەر بـە هـەر کەسـێك دوژمنێکـی دیـار و دوژمنێکی نادیارە ، ئێمە قسەمان لەسـەر دوژمنـە نادیارەکەیـە لـەم بابەتەمانـدا چونکە ، باس لە نەخۆشی و بنەماکانی خۆپارێزی دەکەین وادەخوازێت ئەم دوژمنە نادیارە ڤایرۆس و میکرۆبی زیان بەخش و دووکەڵی ژەهراوی بێ.

---

[1] سورة النساء الاية ٥٩ .
[2] سورة النسـاء الآية ٧١ .

کەواتە : بە پێی ئەو ئایەتە پیرۆزە ﴿خُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ ئەرکە (واجبە) لەسەر ئیمانداران خۆیان بپارێزن لە هەموو ئەو شتانەی هۆکاری سەرەکین بۆ تووشبوون بە نەخۆشی مەترسیدارو کوشندە ئەگینا گوناهبار دەبن.

ئایا ئەوە ڕێنمایی وئامۆژگاری پێغەمبەر نیە ﷺ دەفەرمووێت :

**﴿إذا سمعتم بالطاعون في أرض فلا تدخلوها، وإذا وقع بأرض وأنتم بها فلا تخرجوا منها﴾**[1].

واتە : لە هەر شوێنێك نەخۆشییەکی کۆشندە بڵاو بووەو ئەوا مەچنە ئەوێ، وە هەرکاتێك ئەو نەخۆشییە لە نێوتان بڵاو بووەوە لێی ڕامەکەن تەماشا بکەن ئەم فەرموودەیە **بنەمایەکی بنەرەتی کەرەنتینەکردنە بە دەستەواژەی ئەم سەردەمە** ، لە هەمان کاتدا ڕێگری کردنە لە بڵاوبوونەوەی ئەو پەتا کوشندانەی کە مەترسیدارن بۆ سەر ژیانی کەسەکان لە نێو کۆمەڵگەدا .

پرسیارەکە ئەوەیە ئایا چەندێك لە موسڵمانان وە چەندێك لە مامۆستایانی ئایینی پابەند بوون بەم فەرموودەیەوە ؟؟؟؟ وەڵامەکەی بۆ خوێنەری خۆشەویست جێ دێڵین.

لەگەڵ ئەوەشدا لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

**﴿لا يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ علَى مُصِحٍّ﴾**[2] .

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٧٢٨ ج١٠ ص ٢٢٠ - كتاب الطب - باب ما يذكر في الطاعون .

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٧٧١ ج١٠ ص ٢٩٦ كتاب الطب- باب لا هامة.



ئەگەر ، چی ئەم فەرموودەیە باس لە بابەتێکی دیاریکراو دەکات بەڵام ، ئێمە بە بەردەوامی واتە گشتگیرییەکەی لێوەردەگرین  بە پێی ئەو قاعیدە ئوسوڵییە:

( العبرة بعموم النص لا بخصوص السبب )[1] .

واتە : نابێت نەخۆش تێکەڵی کەسانی لەش ساغ و تەندروست باش بن نەبادا نەخۆشییەکەی بگوازرێتەوە بۆیان ، ئەوە پەیامی فرستادەی خودایە ﷺ بۆ هەموو نەوەی ئادەم .

سەرنج بدەنە ئەم فەرموودەیە چ خوپارێزییەکی تێدایە بۆ گۆمەڵکە ئەگەر ، وەکو خۆی جێبەجێ بکرێت بەڵام ، ئەوەی جێی داخە ، موسڵمانەکان ئەو ئامۆژگارییە گرنگەی سەروەرمان محمد ﷺ پشتگوێ دەخەن و پابەند نابن پێوەی ، وە ناشزانن بەم کردەوەیە گوناهبار دەبن ئەگینا پەیامی پێغەمبەر ﷺ لە خۆیەوە نیە بەڵکو ، هەر ئەو زاتی (الله) یە خستوویەتییە نێو دڵی پێغەمبەرەوە ﷺ کەوا بفەرمووێت بڕوانن خودای مەزن چی لەم بارەیەوە دەفەرمووێت :

---

[1] الكامل في الشريعة والقانون للزلمي ج٤ ص٢٥٥ .

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلا وَحْيٌ يُوحَى﴾[1].

واتە : پێغەمبەر ﷺ لە خۆڕا قسە لەسەر پرسە شەرعییەکان ناکات بەڵکو سەرجەمیان وەحیین لە لایەن خوداوەیە .

بۆیە پێویستە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ پەیڕەوی بکرێن و بچنە بواری جێبەجێ کردنەوە هەر لەبەر ئەوەی ئامانجی سەرەکی ئەو فەرموودانەی پەیوەستە بە پاراستنی نەفسی مرۆڤەکانەوە لە فەوتان ، ئەو خۆپاراستنەش یەکێکە لە ئامانجە خوداییەکان (مقاصد الشريعة) .

هەروەکو ئاماژەمان پێکرد لەوەو پێش **پێویستە لەسەر ئەوانەی تووشی هەر جۆرە ئەنفلۆزایەك دەبن تەنانەت هەڵامەتیش بێ بە پێی ئەم فەرموودەیە کەسە نەخۆشەکان نابێت بەهیچ جۆرێك بچنە شوێنەگشتییەکان بەتایبەت مزگەوتەکان بۆ جێبەجێ کردنی جومعەو جەماعەت تاوەکو چاك دەبنەوە وە ئەگەر ، ناچار بوون بچنە دەرەوە بۆ شتێکی پێویست دەبێت دەمامك و دەستکیش بەکاربهێنن نەبادا کەسانی تر بە خۆیانەوە گرفتار بکەن و تووشی نەخۆشییان بکەن .**

**کەواتە : ئەرکێکی شەرعییە(واجبە) ژیانی کەسانی تر نەخرێتە مەترسییەوە ، چۆن بۆ خۆت حەز ناکەیت تووشی نەخۆشی بیت ، دەبێت حەز نەکەیت براکەتیش نەخۆش بکەوێت مەبەستمان برای شیری نیە تەنها بەڵکو ، براتانن لە ئاین یا لە مرۆڤایەتی سەرنج بدەن پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە چی دەفەرمووێت :**

﴿ لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه﴾[2].

---

[1] سورة النجم الآية ٣-٤ .

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ١٣ ج١ص ٧٩ كتاب الإيمان .

**لەم سەردەمەدا زۆر گرنگە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕەچاوو پەیڕەوی بکرێن بە جۆرێك دەبێت بکرێتە پرۆگرامی خوێندنگاو ئەو پەیمانگایانەی تایبەتن بە گەشە پێدانی مرۆیی بۆ ئەوەی نەوەیەکی تەندروست باش و بەهێز بهێنینە بەرهەم تاوەکوو سبەینێ خزمەت بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بکات نەك ببێتە بار بەسەریەوە.**



زۆر گرنگە بە وردی بڕوانینە ئەو ڕێنماییانەی وەکوو ئاماژەمان پێکرد بەر (١٤٤٠) ساڵ شوێنکەوتووانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کاریان پێکردووە.

تازە لەم سەردەمەی ئێستاماندا ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی جەخت لە شۆرینی دەستەکان دەکەن بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٠ چرکە تاوەکوو پاك بنەوە لەو ڤایرۆسانەی بە دەستەکانەوەن وهەستیان پێناکەین .

چەندێك گرنگە ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییانەی سەروەرمان محمد ﷺ بخەینە ڕوو لە ڕاگەیاندنەکان و سیمینارەکان وشوێنە فەرمی و نافەرمییەکان .

چۆن لە سەردەمی ئیسلام دا گرنگیان داوە بە پاك وخاوێنی جەستەو پۆشاك و

جل وبەرگیان بەڵكو ، پاك وخاوێنییان بە ئەرك (الواجب) زانیوە لە هەمان كاتدا بەرەنگاری ئەو جۆرە ، پەتایانە بوونەتەوە ، كە هەرەشەیەكی جددی بوونە لەسەر ژیانی مرۆڤەكان لەو ساتە وەختەدا .

**مەخابن هەندێك لایەن و كەسانی ساویلكەو كاڵفام هەن لێرەو لەوێ تانەوتەشەر لە پرۆگرامی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەدەن ودەڵێن : سەردەمی ئیسلامەتی بەسەر چوو بەڵام ، لە كاتێكدا هەرچی ڕێنمایی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی هەیە سەبارەت بە ڤایرۆسی كۆرۆناو و پەتا گواستراوەكانی تر سەبارەت بە دوور كەوتنەوەو تێكەڵ نەبوون و كەرەتینە كردنی ئەو شارو شوێنانەی ڤایرۆسەكەی تیا بڵاوبۆتەوە ، سەرجەمیان پێغەمبەر ﷺ لەو سەردەمەدا ئاماژەی پێكردووە و هاوەڵانی (خودای گەورە لێیان رازی بێت) كاریان پێكردووە .**

كەواتە : ڕێنماییەكانی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانی شتێكی تازە نیە بەلای مۆسڵمانان و ئیماندارانەوە بەڵكو ، بەر لە ١٤٤٠ ساڵ پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێكردووە موسڵمانان چۆن خۆیان لەو پەتاو نەخۆشییانە بپارێزن .

بەڵام ئەو ڕێنماییانە بەلایەن جۆرە كەسانێكەوە تازەیە كە دژایەتی ئایین پیرۆزی ئیسلام دەكەن و دەڵێن : سەردەمی ئیسلامەتی بەسەر چوو.

چونكە وا تێگەیشتوون ئایینی پیرۆزی ئیسلام هیچی پێ نیە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو جۆرە ڤایرۆس و پەتا گواستراوانە .

كەواتە : لە بواری پزیشكیدا دەردەكەوێت موسڵمانان پێش هەموو وڵاتە ئەوروپاییەكان كەوتوون .

موسڵمانەكان لەو سەردەمەدا باسی نەخۆشییە گواستراوەكانیان كردووەو چۆنیەتی خۆ پاراستنەكەشیان خستۆتە ڕوو بۆ هەموو كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی

مـەخابن ئـەو ڕێنماییانـە میراتـی خۆمانـە ئیمـڕۆ زلهێزەكـان بـەناوی ڕێكخـراوی تەندروستی جیهانی پێمان دەفرۆشنەوە .

لە كاتێكدا ئیمانداران پابەندكراون بە یاساى خوداوە گوێڕایەڵی پێغەمبـەر ﷺ بن سەرنج بدەن خوای مەزن چی دەفەرمووێت :

﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾[1] .

لەم ئایەتەدا خـودای مـەزن یاسـایەكی بـۆ دانـاوین بریتیـە : لـەوەی هەرچـی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردووە لە پرسە شەرعییەكان دەبـیَ جێبـەجێی بكرێـت وەكوو خۆی بیَ كەم و كورتی وە ئەوەی ڕێگری لێكردووە دەبێـت بـەزووترین كـات لێی دووركەوینەوە و ئەنجامی نەدەین .

ئەگینا ڕووبەرووی سزای خودای باڵادەست دەبینەوە چونكە ، ئەو یاسایە ئەركە (الواجـب) لەسـەر موسـڵمانان گـەر جێبـەجیَ كـرا پاداشـت دەكـرێن وە ئەگـەر ، جێبەجیَ نەكرا سزا دەدرێن .

[1] سورة الحشر الآية ٧ .

ئەوەتا لە ساڵی ١٣٤٨ز (ابن الخطيب)[١].



پزیشك بوو لەو سەردەمەدا لە كتێبێكیدا باس لەو پەتا گواستراوەیە دەكات چۆن بڵاوبۆتەوەو تەشەنەی سەندووە تیایدا دەڵێت :

(دەبێ هەرچی شتێك پەیوەندی بە مرۆڤە تووش بووەكەوە بوو فرێ بدرێت و بەكار نەهێنرێت هەروەها خانووەكەیان دەرمانی پێوە بكرێت واتە : (تعقيم) بكرێت ، لەگەڵ كەسی تووشبوو نابێت تێكەڵاوی هەبێت ڕاستەوخۆ نەبادا ئەو

---

(١) حمد بن عبد الله بن سعيد بن عبد الله بن سعيد بن علي بن أحمد السّلماني الخطيب الشهير لسان الدين ابن الخطيب ولقب ذو الوزارتين وذو العممرين وذو الميتين، (لوشة، ٢٥ رجب ٧١٣ هـ/١٣١٣م - فاس، ٧٧٦ هـ/ ١٣٧٤م) كان علامة أندلسيا فكان شاعرا وكاتبا وفقيها مالكيا ومؤرخا وفيلسوف وطبيبا وسياسيا من الأندلس درس الأدب والطب والفلسفة في جامعة القرويين بمدينة فاس. يشتهر بتأليف قصيدة جادك الغيث وغيرها من القصائد والمؤلفات. قضّى معظم حياته في غرناطة في خدمة بلاط محمد الخامس من بني نصر وعرف بلقب ذي الوزارتين: الأدبّ والسيف. نقشت أشعاره على حوائط قصر الحمراء بغرناطة.
نشأ لسان الدين في أسرة عرفت بالعلم والفضل والجاه، وكان جده الثالث "سعيد" يجلس للعلم والوعظ فعرف بالخطيب ثم لحق اللقب بالأسرة منذ إقامتها في لوشة وكانت أسرة ابن الخطيب من إحدى القبائل العربية القحطانية التي وفدت إلى الأندلس، وتأدّب في غرناطة على شيوخها، - فأخذ عنهم القرآن، والفقه، والتفسير، واللغة، والرواية، والطب./ انظر الموسوعة الحرة.

نەخۆشییە بگوازرێتەوە لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە دەكات نابێت لە دەرەوەی شار كەس بێتە ژوورەوە وە كەسیش نابێت دەربچێتە دەرەوە ، سەرنج بدەن ئەو كەرەنتینەیەی ئێستا لەم سەردەمە دەكرێت هەر هەمان ڕێ وشوێنی جارانە دەیگرنە بەر)[1].

هەڵبەتە ( لەساڵی ١٣٨٢ ز لە ئیتاڵیا تاعون بڵاوبووە وە لە شاری (البندقیە) كاربەدەستانی ئەو شارە هانایان بۆ پزیشكانی عەرەب برد تاوەكو كونترۆڵی ئەو تاعونەیان بۆ بكەن واتە : پشتیان بەوان بەسەت چونكە ، خاوەنی ئەزموون و زانستێكی باش بوون لە بواری تەندروستی دا) [2].



[1] شمس العرب تسطع على الغرب / المستشرقة الألمانية زغريد هونكه ص ٢٧٦ ./ و الأوبئة والتأريخ المرض والقوة والإمبريالية / تأليف شلدون واتس ص ٣٠ .
[2] المصدر نفسه ص٢٧٧ .




جا بۆ ئەوەی كۆمەڵگەیەكی تەندروستمان هەبێت دەبێت پەیڕەوی فەرمانەكانی خودای باڵادەست و گوێڕایەڵی فەرموودە سەحیحەكانی پێغەمبەر ﷺ بین بۆ گۆڕینی واقیعی تەندروستیمان هەندێك ڕێنمایی گرنگ و پێویست هەن بۆ موسڵمانان دەبێت ڕەچاو بكرێن لە دوای بەسەر چوونی ئەم ڤایرۆسە كوشندەیە لەوانە :

تەماشا بكەن خودا چی دەفەرمووێت : ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾[1].

پەیامی خودای مەزن لەم ئایەتە پیرۆزە ئاشكرایە هیچ لێڵییەكی تێدا نیە

[1] سورة الرعد الاية ١١ .

دەفەرمووێت : ئەی نەوەی ئادەم خۆتان دەست بکەن بە چاك کردنەوەی ئەو واقیعەی تێی کەوتوون لە بارودۆخی نالەبارییەوە بۆ سەقامگیری و ئارامی .

نەبادا گومانی ئەوە بکەن خودای مەزن لە بارۆدۆخی ساغ و سەلامەتی و خۆشگوزەرانی لێتان بگۆڕێت بۆ پێچەوانەکی گەر خۆتان بە دەستی خۆتان نەیگۆڕن ئەوە خۆتانن هۆکاری سەرەکین لەوگۆڕانکارییەی بەسەرتان هاتووە لە چاکییەوە بۆ خراپی .

بۆ نموونە : ئەو واقیعە تاڵەی لەم سەردەمەدا تووشی بووین بە هۆی ڤایرۆسی کۆرۆناوە بە لەدەستدانی کەسە نزیك و دۆست و هاورێ و هاونیشتمانەکانمان هەروەها دارمانی بواری ئابووری وبڵاوبوونەوەی بێ ئیش و کاری و هەژاری بەهۆی ئەو پەتایەوە .

هۆکارەکەی بەزاندنی ئەو سنوورەی خودای مەزن بۆی کێشاوین هەروەها پشت گوێخستن و فەرامۆش کردنی ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگارییانەی پزیشك و پسپۆڕانی بواری تەندروستی کەڕۆژانە لە کەناڵە ئاسمانییەکان و سۆشیال میدیایەوە دەیانکرد.



ئەو پزیشك و كارمەندە تەندروستییانە خۆیان ماندوو كردو جێی دەستیان دیارە، وە قوربانیشیان دا بە بەرچاوی هەمووانەوە ڕۆژانە دەمان بیست و دەمان بینی چەندێك پزیشك و كارمەندی تەندروستی تووشبوون و گیانیان لە دەست داوە لە هەموو جیهاندا.

بەڵام ، ئەوە ئێمەین هۆكارین لە بڵاو بوونەوەی ئەو پەتا كوشندەیە دڵنیا بن تاوانی بڵاو بوونەوەی ئەم پەتایە پشكی گەورەی دەكەوێتە سەرئەستۆمان ئەگەر ، چی سیستەمێكی تەندروستی باشمان نیە بەڵام ، دەكرا بە پێی توانا هەر خۆمان بپاراستایە ، لەرێی پابەندبوونمان بەو ڕێنمایی و ئامۆژگاریانەی پسپۆرو شارەزایانی بواری تەندروستی كە ڕۆژانە لە راگەیاندنەكانەوە بڵاو یان دەكردەوە نەك پشت گوێ خستن و فەرامۆش كردنی .

پێمان وایە : تێگەیشتن و جێبەجێكردنی ئەو ئایەتە پیرۆزەی خودای مەزن كە دەفەرموێت :﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾[1] .

---

[1] سورة الرعد الآية ١١ .

ئەرکێکی شەرعییە واتە : واجبە پابەند بین پێوەی لە هەمان کاتدا گەورەترین دەستکەوتە بۆ چاککردن و باشتر کردنی واقعی تەندروستی کۆمەڵگەکەمان لە خراپییەوە بۆ باشکردنی .

ئەگەر ، بەو ئاراستەیە کارمان کرد و هەنگاوی جددیمان نا ئەوا خودای باڵادەستیش پیشتوانمان دەبێت لەو گۆرانکارییە چونکە ، مەرجی خودای مەزن پابەند بوونی ئێمەی نەوەی ئادەمە بە بەرنامەو پرۆگرامەکەیەوە ، هەر بۆیە : پشت گوێخستن و پەیڕەوی نەکردنی فەرمانەکانی خودای مەزن و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ باجەکەی قورس وگەورەیە لە دونیاو قیامەتدا هەروەکو بینیمان چی بەسەر جیهاندا هات بەهۆی ئەو ڤایرۆسەوە .

# پاك و خاوێنی لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ

## چۆنیەتی خۆ پاككردنەوە

سەرنجتان بۆ ئەو فەرموودەیە ڕادەكێشم (سەلمانی فارسی )[1].

دەفەرمووی : پرسیاری ئەوەیان لێكردم : ﴿قَدْ عَلَّمَكُمْ نَبِيُّكُمْ كُلَّ شَيْءٍ، حَتَّى الْخِرَاءَةَ. قَالَ، فَقَالَ: أَجَلْ. لَقَدْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، أَوَ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ، أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ. أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ﴾[2].

واتە : بەجورێكی وەها پێغەمبەرەكەتان ڕێنمایی كردوون چۆن خۆتان پاك بكەنەوە ، بەڵی ئەوە زۆر ڕاستە پێی فەرمووین ﷺ لەكاتی دەست گەیاندن بە ئاو ڕوو لە قیبلە نەكەین ، بەتایبەت شوێنەكە چۆلایی بێت بەڵام ، گەر هاتوو چوار دەوری گیرابوو هیچ كێشەیەكی نیە ئەو ڕوو لە قیبلەیە تەنها بۆ چۆلایی و بیابانەكانە ، هەروەها فێری كردووین بەدەستی ڕاست خۆمان پاك نەكەینەوە لەم سەردەمەدا خەڵكی بە ئاو خۆیان پاك دەكەنەوە جاران لەبەر ئەوەی ئاو كەم بوو

---

[1] سلمان الفارسي (المتوفى سنة ٣٣ هـ) صحابي، ومولى للنبي محمد، وأحد رواة الحديث النبوي، وهو أول الفرس إسلاماً؛ أصله من بلاد فارس، ترك أهله وبلده سعياً وراء معرفة الدين الحق؛ فانتقل بين البلدان ليصحب الرجال الصالحين من القساوسة، إلى أن وصف له أحدهم ظهور نبي في بلاد العرب، ووصف له علامات ليتحقق منه. توفي سلمان في خلافة عثمان بن عفان بالمدائن سنة ٣٣ هـ وقيل توفي سنة ٣٦ هـ وكانت لسلمان زوجة من قبيلة كندة اسمها بقيرة، أما صفته، فقد كان سلمان رجلاً قوياً، طويل الساقين، كثير الشعر. قال عنه الذهبي: «كان لبيبا حازما، من عقلاء الرجال وعبادهم ونبلائهم.» / انظر : سير أعلام النبلاء ج١ ص ٥٠٥ تسلسل ٩١ و موسوعة الحرة .

[2] صحيح مسلم بشرح النووي .رقم الحديث ٢٦٢ج٣ص٥ كتاب الطهارة - باب الاستطابة.

دەست نەدەکەوت بە بەردی زبر خۆیان پاك دەکردەوە تاوەکوو ئەو پیسییە هەڵبگرێت هەر بۆ ئەوە بەردیان بەکار هێناوە سوپاس بۆ خودا لەم سەردەمەدا ئاو زۆرە لەجیاتی بەرد بەکاردەهێنرێت.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿ إنَّما أنا لكم بمنزلةِ الوالدِ أعلِّمُكم ، فإذا أتَى أحَدُكم الغائطَ فلا يَسْتقبِلِ القِبْلةَ، ولا يَسْتدبِرْها، ولا يَستطِبْ بيَمينِه، وكان يأمُرُ بثلاثةِ أحجارٍ، ويَنْهى عن الرَّوثِ والرِّمَّةِ ﴾[1].




﴿ إنَّما أنا لكم بمنزلةِ الوالدِ أعلِّمُكم....] پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : من وەکوو باوکتانم ئەم دەستەواژەیە پێمان دەڵێت : شوێنکەوتووانی دەبێت پێغەمبەر ئاسا بن.

باوك چ رۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی منداڵەکانی وە

---

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٨ ص٢٦ كتاب الطهارة . وصحيح النسائي رقم الحديث ٤٠ ص١٣٣ حسن صحيح .

چەندێك ڕەچاوی بەرژەوەندیان دەکات بەهەمان شێوازیش شوێنکەوتووانی دەبێ خەمخۆری تەندروستی یەکتر بن لەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژین نابێ خۆ پەرست بن.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿ مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ؛ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى ﴾[1].

ئیمانداران دەبێ بەرامبەر یەکتر لە سۆزومیهرەبانی خۆشەویستی وەك یەك جەستە بن گەر ، هاتوو پەنجەیەکی ئازاری پێگەیشت هەموو لاشەت دێشی واتە : ئەو ئێش و ئازارە کاریگەری دەبێ لەسەر هەموو جەستە .

کەواتە : مرۆڤی ئیماندار نابێ تەنها بۆ خۆی بژیت و بڵێ پەیوەندیم بەکەسەوە نیە بۆ نموونە:

دەبێ تەندروستی کۆمەڵگەی بەلاوە گرنگ بێ چۆن چاودێری خۆی دەکات دەبێ بە هەمان شێواز چاودێری کۆمەڵگەکەی بکات خۆڵ و خاشاك و تف وبەڵغەمی فرێ نەداتە ڕێگاوبانی هاونیشتمانیانی ، نەبادا ببێتە سەرچاوەی بڵاو بوونەوەی نەخۆشی و پەتای وەرزی بەڵکو ، دەبێ ئەو خوڵ و خاشاکەی لە شوێنی تایبەتی دابنێت و بیخاتە کیسەی تایبەتییەوە سەری کیسەکەش گرێ بدات.

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٦٠١١ج١٠ ص٥٣٨ كتاب الأدب و صحيح مسلم بشرح الإمام النووي رقم الحديث ٢٥٨٦ ج٨ ص١٩٢ كتاب البر والصلة اللفظ له .



تەماشا بکەن ئاینی پیرۆزی ئیسلام چۆن ڕێنمایی و ئامۆژگاری پێداوین سەبارەت بەم بابەتە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿...وإماطتك الحجر والشّوكة والعظم عن الطريق لك صدقة...﴾[1].



واتە : لابردنی هەر شتێك نموونەی بەرد و ئێسك و دڕك یا شتی زیانبەخش لە

---

[1] سنن الترمذي رقم الحديث ١٩٥٦ ص ٤٤٥ باب - ما جاء في صنائع المعروف , حديث صحيح.

ڕێگاوبانی خەڵکی به سەدەقە و خێر هەژمار دەکرێت لە تەرازوی کارەکانت .

سەرنجتان بۆ ئەو فەرموودەیە ڕادەکێشم پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویٚ :

﴿ إياكم والجلوسَ بالطرقاتِ . قالوا: يا رسولَ اللهِ ، ما بُدٌّ لنا من مجالسنا نتحدثُ فيها، فقال رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: إن أبيتم فأعطوا الطريقَ حقَّه . قالوا: وما حقُّ الطريقِ يا رسولَ اللهِ؟ قال: غضُّ البصرِ، وكفُّ الأذى، وردُّ السلامِ ، والأمرُ بالمعروفِ ، والنهي عن المنكرِ﴾[1] .



پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی ئاگادار کردەوە لەوەی لە ڕێ بانەکان دانەنیش ئەوانیش وتیان چارمان نیە لەکوێ دانیشین قسەو باسی خۆمان بکەین پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دانیشن بەو مەرجەی مافی ڕێگاکە بدەن ووتیان مافی ڕێگا چیە ئەی فرستادەی خودا ؟

دیار بوو وەڵامەکەی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوو لە پێنج ماف ، ئەوەی مەبەستمانە لەم فەرموودەیە بیخەینە ڕوو **مافی دووەمە** بریتیە : لە (كفُّ الأذى) مەبەستی ئازاردانی خەڵکە بە زمان دیارە نامانەوێت لەسەری بدوێین و بەکردەوەش

[1] عون المعبود شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٤٨١٥ص ٢٢٢٢ كتاب الأدب - باب في الجلوس بالطرقات حديث صحيح.

بریتیە لەوەی شتی خراپ فڕێ بدەیتە نێو ڕێگایانەوە لە زبڵ و خاشاك و تف و بەڵغەم و...هتد .

چونکە لە دەرئەنجامدا ئەو تف و بەڵغەم وخۆڵ و خاشاکانە ژینگە پیس دەکەن و دەبنە سەرچاوەی نەخۆشی سەرجەم دانیشتوانی ئەو ناوچەیە زەرەر مەند دەبن لێی، ئەمەش پێچەوانەی ئامانجە خوداییەکانە (مقاصد الشريعة) یە بریتیە :

لە پاراستنی ﴿ پاراستنی ئاین و نەفس و ناموس وسامان و ژیریی﴾[1].

ئەوەی مەبەستمانە ئاماژەی پێبکەین پاراستنی نەفسە دەبێت ئەوەی گرنگ وپێویستە بۆ مانەوەی ژیان و بەردەوامبوونی درێغی و کەمتەرخەمی لێنەکەین ، وەکو گرنگی دان بە تەندروستی لەڕووی خواردنی پاك و چۆنیەتی دوور کەوتنەوە لەو شوێنانەی گومانی لێدەکرێت تووشی پەتای کوشندە بین لێوەی خۆپاراستن لە نەخۆشییە کوشندەکان بە چوونە لای پزیشك بۆ چارەسەرکردن و وەرگرتنی عیلاج و بەکارهێنانی داوودەرمان .

## دەست نوێژگرتن :

هەڵبەتە دەست نوێژ گرتن ئامادەکارییە بۆ خوداپەرستییەکی گەورەو تایبەت ئەویش نوێژە چونکە ، بێ پاك و خاوێنی ئەو خوداپەرستییە وەرناگیرێت دەبێ جەستەو پۆشاك و شوێنی نوێژ کردنەکەش و پاك و خاوێن بێ.

خودای مەزن فەرمانی کردووە هەرکاتێك ویستان نوێژ بکەن دەبێ جەستەو پوشاکتان پاك وخاوێن بێ دیارە لەو ئایەتە ڕێنمای ئیمانداری کردووە چۆن خۆیان

---

[1] الموافقات / الشاطبي / ج٢ ص ٨ .

ئامادەبکەن بۆ نوێژ دەفەرمووێت : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ... ﴾[1] .

کەواتە : پاك و خاوێنی سیمای شوێنکەوتووانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە ئەگەر بەشێوەیەکی زانستیش لێکی بدەینەوە بۆمان ئاشکرا دەبێت ئەو پاك وخاوێنییەی خودای گەورە ئاماژەی پێکردووە بۆ ئامادەکاری نوێژکردن لە هەمان کات دا بنەمایەکی سەرەکی خۆپارێزیشە لە میکرۆب و ڤایرۆس و هەندێ نەخۆشی .



هەڵبەتە ڕۆژی پینج جار بەشێك لە جەستەی مرۆڤ بە ئاو پاك وخاوێن بکرێتەوە هیچ بۆنێکی ناخۆشی پێوە نامێنێت .

[1] سورة المائدة الآية ٦ .

الوضوء: يتكرر عدة مرات يومياً، وينظف الأجزاء المكشوفة من جسم الإنسان، وهي الأكثر تلوثاً بالجراثيم، وقد أثبت علماء الجراثيم وجود أعداد هائلة من الجراثيم على السنتمتر المربع من الجلد الطبيعي، وفي المناطق المكشوفة يتراوح العدد بين ١-٥ مليون/سم٢(٤). وهذه الجراثيم في تكاثر مستمر، حتى قد تصل إلى ضعف ذلك في ساعة، وللتخلص منها لا بد من غسل الجلد باستمرار، ولا غسل أكثر ديمومة وتكراراً من الوضوء الذي أمرنا الله به، وحثنا عليه رسول الله صلى الله عليه وسلم حيث قال

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ :

﴿ أرأيْتُمْ لو أنّ نَهَرًا ببابِ أحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فيه كُلَّ يَومٍ خَمْسًا، ما تَقُولُ ذلكَ يُبْقِي مِن دَرَنِهِ؟ قالوا: لا يُبْقِي مِن دَرَنِهِ شيئًا ....... ﴾[1].



زانایانی بایۆلۆجی دەڵێن ( لە هەر سانتیمەترێکی دووجا لەسەر پێستی

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٢٨ ج٢ ص ١٥ كتاب مواقيت الصلاة – باب – الصلوات الخمس كفارة .

هەرکەسێك زیاتر( ١ — ٥ )ملیۆن میکرۆب کۆدەبنەوە بەردەوامیش لە زیاد بوونن پێویستە بشۆرێن چونکە باشترین رێگە چارەسەرە بۆ لابردنی ئەو میکرۆب وڤایرۆسانە)[١].



وێنەی میکرۆب لەسەر دەستەکان

ئەگەر سەرنجێك لەو فەرموودەیەی پێشەوامان محمد ﷺ بدەین ڕێنمایی و چۆنیەتی دەست نوێژ گرتنی شی دەکردەوە بۆ یەکێك لە هاوەڵەکانی لەوکاتەی پرسیاری ئەوەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد چۆن دەست نوێژ بشۆرم فەرمووی بەو شێوازە دەست نوێژ بگرە :

﴿ أسبغ الوضوءَ وخلّل بينَ الأصابع .......﴾[٢].

واتە : دەستویژەکەت بە مەرجەکانییەوە بگرەو نێوانی پەنجەکانیشت بشۆرە.

---

(١) تفوق الطب الوقائي في الإسلام / ص٧ .

(٢) مرقاة المفاتيح - شرح مشكاة المصابيح / رقم الحديث ٤٠٥ ج٢ ص١٠٧ كتاب الطهارة - باب - سنن الوضوء / و سنن الترمذي رقم الحديث ٧٨٨ ص ١٩٣ باب - كراهية مبالغة الإستنشاق للصائم / حديث صحيح .




بڕوانن شۆرینی نێو پەنجەكان دەلالەت لەوە دەكات ئاینی پیرۆزی ئیسلام جەخت لە پاك وخوێنی دەكاتەوە لە ڕووی زانستی تەندروستیشەوە باشترین ڕێگە چارەسەرە بۆ لابردنی ئەو میكروب و ڤایرۆسانەی بە دەستەكانەوە نیشتوون و نابینرێن و هەستیان پێناكرێت ئەمیش **بنەمایەكی تری خۆپارێزییە لە نەخۆشی و میكرۆب و ڤایرۆس .**

سەرنج بدەن پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : (**إذا توضأت فأبلغ المضمضة والاستنشاق ما لم تكن صائمًا**)[1].

جارێكی تر لەو فەرموودەیەدا هاتووە هەر كاتێك ، دەستنوێژت گرت ئاو بخەرە دەمتەوەو لووتت پاك بكەرەوە بەهەڵمژینی ئاو .

واتە : غەرغەرەی پێبكە بەو مەرجەی بەرۆژوو نەبێ نەوەكوو ئاو بچێتە نێو سكتەوە ڕۆژووەكەت بشكێ .

[1] بيان الوهم والإيهام الواقعين في كتاب الأحكام / رقم الحديث ٢٨١٠ ج٥ ص٥٩٣ , / و كتاب الأحكام الوسطى من حديث النبي ﷺ / ج١ ص ١٦٧,/ و سنن النسائي وهو المجتبى: رقم الحديث ٩١ ص ١٤٣ باب - بأي اليدين يستنثر.




**نظافة الفم:**

(الفم مدخل رئيسي للجسم ، منه تعبر أرتال من الجراثيم الضارة، وفيه تستقر أنواع وأعداد عائلة من الجراثيم البيكتيرية والفيروسية والطفيلية، وقد زادت أنواعها في فم الإنسان عن مائة نوع كما تقدر أعدادها أحيانا بالملايين وأخرى بالبلايين في المللتر المكعب الواحد من اللعاب وهي تتغذى على بقايا الطعام المتسرب على الأسنان وبينهما، وينتج عن نموها وتكاثرها أحماض وإفرازات كثيرة، تؤثر على الفم ورائحتهن وعلى الأسنان ولونها وأدائها ومن الأمراض التي تسببها تسوس الأسنان والإلتهابات اللثة)[1].



[1] تفوق الطب الوقائي في الإسلام / ص١٠.

**(ومنذ عهد الرومان حتى القرن السادس عشر انتشرت في أوروبا عادة المضمضة بالبول، وقد كانوا يفضلون البول الإسباني، فإن لم يتيسر استعاضوا عنه ببول الثيران)[1].**



تقدم الوقاية

يحسن بنا ان نبين ان طرق الوقاية اخذت تتبدل بخطى وئيدة من المجوج والمرذول الى المعقول والمقبول وخاصة فيما يتعلق بالفم . ولقد عنيت بعض الاديان بالفم وطهارته عناية خاصة وهكذا فرض محمد ﷺ على المسلمين استعمال السواك لتطهير الفم وعده ركناً سادساً من اركان الاسلام القرآنية (٢) والسواك عبارة عن قشرة نوع من الجوز تحتوي على نسبة عالية من العفص والكلس والحديد . ويستعمل نساء العرب حتى اليوم السواك فيدلكن به اللثة فتحمر ويفركن به الاسنان فتبيض وكذلك الحال عند الهنود حيث تقضي دياناتهم بالعناية في جمال الاسنان .

وكان الغربيون في القرون الوسطى اقل تذوقاً بالنظافة من الشعوب المتوحشة ويحكتنا المجاز ما كانوا يعملونه لوقاية اسنانهم؛ من ذلك المضمضة بالبول كما كان شائعاً عند نبيلات الرومان . وكانوا يفضلون البول الآتي من اسبانيا فاذا لم يتيسر استعاضوا عنه ببول الثيران وقد كان ذلك شائعاً في القرن السادس

(١) Franciscus de la Haye

(٢) ainsi Mahomet prescrit, au sixieme commandement coranique faire usage de so ıak pour la bouche

— ٢٩ —

**لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ :**

**﴿ لولا أنْ أشُقّ على أمّتي لأمَرتُهم بالسّواكِ مع كلّ وُضوءٍ﴾[2].**

**واتە: ئەگەر ، لەسەر شوێنکەوتووانم بارگرانی نەبوایە ئەوا فەرمانم پێدەکردن سیواك بەکاربهێنن لەگەڵ هەموو دەست نوێژگرتنێك .**

**کاتێك دەڕوانیتە ئەم فەرموودەیە لە ڕووی زانستییەوە سیواك کردن بریتیە : لە لابردن و نەهێشتنی ئەو ملیونەها میکرۆبەی لە نێو دەمدا کۆبۆتەوە بەهۆی**

---

[1] رسالة في تأريخ الطب / الدكتور شوكت الشطي ص٢٩ .

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث١٩٣٤ ج ٤ص٢٠١ كتاب الصوم- باب - سواك الرطبِ واليابس للصائم .

پاشماوەی ئەو خواردنانەی ماونەتەوە لە نێو ددانەکاندا پێویستیان بە شۆرین هەیە لە ڕێی سیواك و ئاو لەدەم وەردانەوە.



هەر بۆ زانیاریتان (اللهُ أعْلَم) لەم سەردەمەدا بەکارهێنانی مەعجون وفلَچەی ددان شۆڕین شوێنی ئەو سیواکە دەگرێتەوە ، گرنگ لە بەکارهێنانی سیواك لابردن و نەهێشتنی بۆنی ناخۆشی دەم و پاشماوەی خواردنەکانە جا بە هەر گیراوە ومەعجونێکی ددان نێو دەم پاك بکرێتەوە جێگەی سیواك دەگرێتەوە .



هەر لە هەمان فەرموودەدا ئاماژەكراوە بەلووتیش ئاو هەڵمژیت (الإستنشاق) و ئینجا فن بكرێت هەر وەكوو ئاماژەمان پێكرد شۆرینی دەم و لـووت دەلالەتـە لـە چەخت كردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە لەسەر پاك وخـاوێنی شـوێنكەوتووانی وە لەڕووی تەندروستیشەوە بـۆ ئـەوەی بـەردەوام دوور بـن لـە نەخۆشـی و هەسـتیاری ( الحساسية) و پـەتا ودرزییـەكانی وەك ئـەنفلۆزای بـەرازو پەلـەوەڕو هەڵامـەت و....هتد .

ڕۆژانە پێنج جار ئـاو لـە دەم ولـووت وەربـدرێت بێگومـان بـەدوور دەبـن لـەو نەخۆشییە گواستراوانەی لە ڕێگەی هەڵمژینی هەواوە تووشی دەبن.



فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بە جۆرێك جەخت لـە ئـاو وەردان لـە دەم ولـووت دەکات (المضمضة والإستنشاق).

بە پێویستی دەزانین هەڵوەستەیەك لەسەر ئەم بابەتی (المضمضة والإستنشاق) بکەین وەئایا پەیوەندی ئەم ئاو وەردانە لە دەم ولووت لەگەڵ فەرموودەی عشر من (الفطرة) چیە ؟

ئەگەر بڕوانینە ئەو فەرموودەیە : [عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الأظْفَارِ ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الإِبِطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ][1].

ئەم دە(١٠) شتەی لەم فەرموودەیە هاتووە باس لە پاك و خاوێنی دەکات بە واتایەکی تر مەبەست لە ڕزگار بوونی جەستەی مرۆڤەکانە کاتێك پیس و چڵکن دەبن بە هۆی تۆزو خۆڵ و میکرۆب و ڤایرۆسەوە بە دەستەواژەی ئەم سەردەمە بەردەوام پێویستیان بە پاککردنەوە هەیە هەر بۆ زانیاریتان لە فەرموودەیەکی تردا

[1] صحيح مسلم بشرح النووي .رقم الحديث٢٦١ ج٣ ص ٤٨ كتاب الطهارة – باب – خصال الفطرة .

باس لە (المضمضة)ش کراوە [من الفطرة المضمضة والاستنشاق .....][1].

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت پێمان بڵێت : ئەم دە (١٠) شتە هەموو مرۆڤێك بێ جیاوازی ئەوەی موسڵمان بێ یا کافر بێ دەبێت جێبەجێی بکات چونکە ، زەحمەتە خۆت لە تووکی بن باڵ وبەر و نینۆك درێژی و ...... هتد ، پاك نەکەیتەوە.

واتە: بەسروشتی مرۆڤ خۆی لێیان ڕزگار دەکات بێ ئەوەی پابەند بوونێکی بە ئایینەوە هەبێ .

کەواتە : پێمان وایە مەبەست لەو (١٠) شتە پاك و خاوێنییە (الله أعلم).

بەڵام ئەوەی بیەوێت فەرموودەکە جێبەجێبکات بە تەواوی ڕازو نیازی نێو دڵی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ بێت ، بێگومان پاداشتی هەیە لای خودای باڵادەست.

سەرنجتان بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ڕادەکێشم سەبارەت بە دەستنوێژی ئیماندارێك تەماشا بکەن پێغەمبەر ﷺ بە چ شێوازێك باسی دەکات و چەند جار دەستەواژەی (الخطايا) تیا بەکارهێناوە ؟ ئایا مەبەستی لە(الخطايا) تەنها گوناهە ؟؟؟ دەفەرمووێت :

﴿ إذا تَوضَّأ العبدُ المؤمنُ ، فمضمضَ خرجتِ **الخطايا** من فيه ، فإذا استَنثرَ خرجتِ **الخطايا** من أنفه فإذا غسلَ وجهَه خرجت **الخطايا** من وجهِه حتَّى تخرجَ من تحت أشفارِ عينيه فإذا غسلَ يدَيه خرجت **الخطايا** من يدَيه حتَّى تخرجَ من تحت أظفارِ يدَيه فإذا مسح برأسِه خرجت **الخطايا** من رأسه حتَّى تخرجَ من أُذُنيه فإذا غسلَ رجليه خرجت **الخطايا** من رجليه حتَّى تخرجَ من تحتِ أظفارِ رجليهِ ثمَّ كانَ مشيُه إلى المسجدِ وصلاتُه نافلةً له ﴾[2].

---

[1] سنن ابن ماجه رقم الحديث ٢٩٤ ج١ ص١٩٦ باب الفطرة .

[2] سنن النسائي الكبرى / رقم الحديث ١٠٧ ج١ ص١١٤ حديث صحيح .

هەڵبەتە دوو ئاڕاستە هەن بۆ ڕاڤە کردن وشرۆڤەی ئەم فەرموودەیە :

**ئاڕاستەی یەکەم :**

تایبەتە بە خوداپەرستییەوە ئاشکرایە واتای (الخطایا) گوناه کردنە جا بە هەر ئەندامێکی جەستە بێ.

بۆ نموونە:

بەدەم و زمان قسەی کرج و کاڵ بەم و ئەو دەڵێن بۆ سڕینەوەی ئەو گوناهانە لە کاتی دەستنوێژ گرتندا کە(المضمضَة) دەکەن خوداي مەزن لەسەر زاری پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندوون ئەو گوناهانەی سڕیوەتەوە بە هەمان شێوازگوناهی ئەندامەکانی تری جەستەش بەو دەستنوێژ گرتنە خودای گەورە دەیانسڕێتەوە .

**ئاڕاستەی دووەم :**

تایبەتە بە لایەنی زانستییەوە پێمان وایە :

ئەم بابەتەیان مەبەستی سەرەکییە لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی واتای فەرموودەکە وادەخوازێت (اللہ أعلم) .

بڕوانن دەستەواژەی (الخطایا) لێرەدا مەبەستی گوناه نیە ئەوەندەی مەبەستی خوڵ و تۆزی دوورگەی عەرەب بووە بە زمانی ئەم سەردەمەش ڕێك واتای میکرۆب و ڤایرۆس دەگرێتەوە چونکە ، ئەو سەردەمەی پێغەمبەر ﷺ لە دەرئەنجامی ئەوەی هاتن وچوونیان هەر بە پیادەیی و سواری وشتر بووە خۆڵ و تۆزی زۆریان پێوە نووساوە و چۆتە نیو قژو برژانگی چاوو نیو دەم و کونە لووتیانەوە جا بۆ ئەوەی ڕزگاربن لەو خۆڵ وتۆزە پێغەمبەر ﷺ هانی داون بەردەوام لەکاتی

دەستنوێژگرتن ئەو ئەندامانەی جەستەیان پاك و خاوێن بكەنەوە ئەگینا پێم نالێن گوناهی قژ یا ژێری نینۆك و یاخود برژانگی چاو چیە ؟؟؟

بێجگە لە پێوە نووسانی میكرۆب و ڤایرۆس نەبێ بە دەستەواژەی زانستی پزیشكی ئەم سەردەمە.

دەكرێت ئەم فەرموودەیە وەك بنەمایەكی خۆپاراستن لە نەخۆشیە درمەكان و پەتا وەرزییەكان هەژماربكرێت وكاری لەسەر بكرێت.



ئاشكرایە ئەم پرسی (المضمضة والإستنشاق) [1].

[1] شرح فتح القدير / ج١ ص٦٠ / والمغني لابن القدامة : ج١ ص١٤٣ / ومغني المحتاج ج١ص١١٩ / مواهب الجليل لشرح مختصر الخليل ج١ ص٤٥٨ / والفقه الإسلامي وأدلته ج١ ص٣٦٩

مشتومڕێکی لای زانایانی فیقهی ئیسلامی دروست کردووە هەندێکیان بەئەرکی (الواجب) دەزانن بەڵام ، هەندێکی تریان بە سوننەتی دەزان حەز دەکەم بگەرێنەوە سەرچاوە فیقهیە باوەڕپێکراوەکان بۆ ئەم بابەتە.

ئەوەی بەلامانەوە گرنگە لەم بابەتەماندا لایەنی پاك وخاوێنی و خۆپارێزییەکەیەتی نەك لایەنی خوداپەرستییەکەی ئەگەرچی ئەو لایەنەش زۆر گرنگە بۆ ئیمانداران .

## پاك و خاوێنی قاپ ومەنجەل

سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت :

﴿ غَطُّوا الإناءَ، وأَوْكُوا السِّقاءَ، فإنَّ في السَّنَةِ لَيْلَةً يَنْزِلُ فيها وباءٌ، لا يَمُرُّ بإناء ليسَ عليه غطاءٌ، أَوْ سقاء ليسَ عليه وِكاءٌ، إلَّا نَزَلَ فيه من ذلكَ الوَباء. وفي رواية : فإنَّ في السَّنَةِ يَوْمًا يَنْزِلُ فيه وباءٌ﴾ [1].




[1] صحيح مسلم بشرح الإمام النووي رقم الحديث ٢٠١٤ كتاب الأشربة - باب استحباب تخمير الإناء .

ئەم فەرموودەیە بە كوردی و كورتییەكەی باس لە چۆنیەتی پاك وخاوێنی و خۆ پاراستن دەكات لە پەتا وەرزییەكان .

كەواتە : نابێت ئێمەی موسڵمان ئەم هۆشداری و ئامۆژگارییانەی پێغەمبەر ﷺ بە هەند وەرنەگرین .

دەبێت ئەو قاپ و دەفرانەی خواردن وخواردنەوەی تیا دەخۆرێن داپۆشراو بن نەك پێچەوانەكەی چونكە ، بە سەركراوەیی زیان بە تەندروستی كەسەكان دەگەیەنێ لەوەیە تۆزو خۆڵ بچێتە نێو قاپ و دەفرەكانەوە ، ئەوكات پڕ دەبن لە جۆرەها ڤایرۆس ئێمە هەستیان پێ ناكەین و نایان بینین بە چاو.

بەڕاستی ئەوەی پێغەمبەرﷺ هۆشداری پێداوە لەو سەردەمەدا وە لە ئێستاو ئاییندەشدا هەر ئەو پەتا وەرزییانەی تووش كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەبێت ، بۆیە هەموو جیهان دەبێت ئەوە باش بزانن ١٤٤٢ ساڵ پێش ئێستا ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئاماژەی بە چۆنیەتی خۆپارستن لە پەتای وەرزی كردووە جا لەژێر هەر ناوێكدا بێت وەكو پەتای ئەنفلۆزای (باڵندە و ...بەراز ... سارس.....هتد) .

## لە كاتی پژمین چی بكرێت تەندروستە

ئێوە تەماشا بكەن لەو ڕێنماییە بەسوودانەی پێغەمبەر ﷺ بۆ نموونە :

كاتی بژمین چی پێویستە بكرێت : كان رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم

﴿إذا عَ طَسَ وضَعَ يدَه ، أو ثوبَه على فيه ، وخَفَضَ ، أو غَضَّ بها صوتَه﴾[1].

---

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / الألباني رقم الحديث ٥٠٢٩ كتاب الأدب - باب العطاس - حديث صحيح .



بڕوانن کاتێ پێغەمبەر ﷺ پژمیوە دەستی یا چەمکی کراسەکەی داناوە لەسەر دەمی مبارەکی یا سەری داگرتووە بە هێواشی بژمیوە دەنگی بەرزەوە نەکردووە.

کەواتە : شوێنکەوتووانی فێری ئەوەکردووە بەو شێوازە بپژمن بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەیان بپارێزن نەبادا نەخۆش بن ئەو دڵۆپە لیکانەی نێو دەمیان بە شێوەی پریشك بگوازرێتەوە بۆیان .

ئەو خۆ پاراستنە ئێستا ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی تەندروستی باسی لێوە دەکات وەك ڕێنماییەك شۆری دەکاتەوە بۆ سەرجەم وڵاتانی بەشداربوو لەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییە هەمان ئەو خۆپاراستنەیە سەروەرمان محمد ﷺ ئاماژەی پێکردووە .

## پاراستنی ژینگە :

ئایینی پیرۆزی ئیسلام گرنگییەكی زۆری داوە بە ژینگە لە ڕووی پاراستنییەوە بە چاندنی درەخت و سەوزایی كردن و پیس نەكردنی بەهۆی دووكەڵ و ژەهراوی كردنیەوە لە هەمان كاتدا ڕێگری كردووە لە بڕینەوەی درەخت سەرنج بدەن خودا سەبارەت بە تێكدان و وێرانكردنی زەوی چی فەرمووە :

﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾[1].

واتە : نەكەن بە هیچ جۆرێك گەندەڵی و خراپە و وێرانكاری لەسەر ئەو زەوییە بكەن كە بۆمان چاكردوون تاوەكوو لەسەری بژێن.

هەڵبەتە تێكدان و وێرانكردنی ئەو زەوییەی لەسەر دەژین بەزۆر شێواز دەبێت لەوانە : بە پیس كردنی ژینگەكەی بە دووكەڵ و ژەهراوی كردنی ئاوو هەواو و وشك كردنی سەرچاوەی ئاو كانیاوی هەروەها بڕینەوە و دەركردنی دارو درەختی هەموو جۆرەدرەختێك بە هەڵكێشانی بێ لەڕەگەوە یا بە سووتاندنی بێت .

بڕوانن خودای مەزن بە نەوەی ئادەم چی دەفەرمووێت : (مكناكم في الأرض وجعلنا لكم فيها معايش قليلا ما تشكرون) [2].

واتە : تواناودەستەڵاتمان پێداون لەسەر زەوی بژین تا ئاوەدانی بكەنەوە لە ڕووی بیناسازی وكشتوكاڵ وپیشەسازی كردنەوە ، وە بەشێوازێك ئەو زەوییەمان تەرخان وسازكردووە كە بژێوی ژیانتان تیا دابین بكەن لەگەڵ ئەوەی كەمێكتان سوپاس گوزارن لەسەر ئەو ئەو نیعمەتانەی پێمان داون.

---

[1] سورة الأعراف الآية ٥٦.

[2] سورة الاعراف الاية ١٠ .

**دیاره خراپەکاری و بەد خوویی دووجۆرن مادی و مەعنەوی :**

(والإفساد في الأرض يشمل الإفساد المادي ، بتخريب العامر، وإماتة الأحياء ، وتلويث الطاهرات ، وتبديد الطاقات ، وإستنزاف الموارد في غير حاجة ولا مصلحة ، وتعطيل المنافع وأدواتها ، كما تشمل الإفساد المعنوي ، كمعصية الله تعالى ، ومخالفة أمره ، والكفر بنعمته ، والتمرد على شريعته ، والاعتداء على حرماته ، وإشاعة الفواحش ما ظهر منها وما بطن، وترويج الرذائل ، ومحاربة الفضائل ، وتقديم الأشرار ، وتأخير الأخيار ، وتجبر الأقوياء على الضعفاء ، وقسوة الأغنياء على الفقراء) [1].

**ئەگەر تێبینی ئایەتەکە بکەن کە خودا دەفەرمووێت:(مكناكم في الأرض) دەردەکەوێت ئەم فەرمانەی خودا بۆ پاراستن وپارێزگاری کردنە لە ژینگە بە شێوازێکی تەندروست نەك وێران پیس کردنی، خودا جێگیرو نیشتەجێی کردووین لەسەر زەوی، خۆ دەبێت لە ئاستی ئەو بە پرسیارییەتەدا بین نەك پێچەوانەکەی .**

**لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بە لێکدانەوە و شرۆڤە کردنی ئیمام ئیمامی (الضحّاك)[2].**

**سەبارەت بەو ئایەتە ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾ بکەم دەڵێت :**

**( لا تغوروا الماء المعين، ولا تقطعوا الشجر المثمر ضرارًا)[3].**

**واتە : سەرچاوەی ئاوو کانیاوەکان تێك مەدەن و وشکیان بکەن هەروەها**

---

[1] رعاية البينة في شريعة الاسلام . د يوسف القرضاوي ص٦٨ .

[2] الضحاك بن مزاحم من بني هلال، وكنيته أبو محمد، وقيل أبو القاسم، تابعي، مفسّر، وأحد رواة الحديث النبوي، روى له أصحاب السنن الأربعة , ولد في بلخ قال الذهبي: «صاحب التفسير كان من أوعية العلم، وليس بالمجود لحديثه ، وهو صدوق في نفسه , توفي توفي سنة ١٠٢ هـ في خراسان الكبرى . أنظر : سير أعلام النبلاء ج٤ ص ٥٩٨ .

[3] الجامع لأحكام القرآن : تفسير القطبي ج٧ ص١٨٥.

درەختەکانیش مەبڕنەوە زیان لەخەڵکی و ژینگە مەدەن چونکە ، بە بڕینەوەی دارودرەخت ڕێژەی ئۆکسجین کەم دەبێت لە هەوادا مەخابن کەسانێك هەن بە دەستی خوێناوی تاوانکارییانەوە نەك هەر زیانیان بە ژینگە گەیاندووە بەڵکو ، بە هەزارەها خەڵکی سڤیلیش ژەهراوی دەکەن بە بۆمبای کیمیاوی .

بۆ نموونە : سەددامی خوێنرێژو عەلی حەسن مەجید لە ١٦ -٣- ١٩٨٨ کاتێك بەچەکی کیمایی بۆردومانی شاری هەڵەبجەیان کرد هەزارەهای لە میللەتەکەمان شەهیدو بریندارکرد هەر لەبەر ئەوەی کورد بوون بە بۆمبی کیمیایی لە جۆری گازی (خەردەل وسیانید) .



بەڵکو شوێنەکانی وەك گۆپتەپەو عەسکەرو شیخ وەسانان و بالیسان وهەندێ شوێنی تر لە کوردستان بەر شاڵاوی ئەو بۆمبە کیمیاوییە کەوتن .



(ئەو ڕۆژنامەنوسانەی لەهەڵەبجە گەڕانەوە )

هەڵەبجە بویە مەیدانی جەنگێکی نابەرامبەر بویە جێ نیشانەی بەعسیان بۆ قەتڵ وعامکردنی گەلەکەی بۆ سەرینەوەی نەخشەی شارێک ئەوەبوو لەکاتژمێر ١١:٣٥ خولەك ڕژێمی بەعس بەهۆی فرۆکە جەنگیەکانیەوە [illegible] لەجۆری باجەر و سیخۆیی کەوتە جێبەجێکردنی پیلان وبەرنامە داڕێژراوەکەی ..لەم هێرشەدا ڕژێمی [illegible] جۆر بەکارهێنانی دەیان فرۆکەی جەنگیەوە چەندین جۆر بۆمبی کیمیایی وبۆمبی ئاسایی (تقلیدی ) و بۆمبی کیمیایی لەجۆری گازی (خەردەل و سیانید ) .

ڕژێمی بەعس لەم هێرشەیدا سەرەتا بەبەکارهێنانی بۆمبە تەقلید و ناپاڵمەکان دەستی پێکرد وپاش تێپەڕبوونی کەمتر لەسێ کاتژمێر بۆمبی کیمیایی بەکارهێنا

سەرباری گازی سیانید زیاتر بەبۆمبی گازی خەردەل بۆردوومانی شارەکەی کرد.

لەدەرئەنجامی ئەم هێرشە وەحشیانەی ڕژێمی بەعس بۆسەرخەڵکی بێدیفاعی هەڵەبجە زیاتر لە پێنج هەزار هاووڵاتی شەهید بوون کە زۆربەیان منداڵ وژن و بەساڵاچوو بون لەگەڵ بریندار بوونی زیاتر لە دەهەزار هاووڵاتی دیکە وئاوارە ودەربەدەربوونی سەرجەم دانیشتوانی شارەکە بۆ وڵاتی ئێران ونیشتەجێ بونیان لەئۆردوگاکانی شارە جیاجیاکانی ئەو وڵاتە .بڵاوبونەوەی کارەساتێکی لەم چەشنە لەسەدەی بیستەم دا کە بەیەکەمین تاوان دێت لەجیهاندا لەپاش جەنگی جیهانی دووەم بوو بەمایەی گرنگی زۆرێك لەڕۆژنامەنوسانی جیهان ..لەم ڕوانگەیەوە ژمارە گەلێك لەڕۆژنامەنوسانی ئێرانی وبیانی کە بۆ کەناڵە جیاجیاکانی میدیا کاریان دەکرد سەردانی هەڵەبجەیان کرد .ئەم سەردانە بۆژمارەیەك لەو ڕۆژنامەنوسانە ڕێگەیەکی پڕمەترسی بوو کە دواجار بووە مایەی گیانلەدەستدانی

٩



قوربانیانی ژەهری کیمایی لە هەڵەبجە



قوربانیانی ژەهری کیمایی لە هەڵەبجە

ڕژێمی بەعس مەبەستم سەددامی خوێنرێژو دارو دەستەکەی هەوای کوردستانیان ژەهراوی کرد تا ئێستاشی پێوە بێت کاریگەری ئەو ژەهرە ماوە لەسەر بریندارەکانی ئەو چەکی کیمیاوییە هەروەها بەوە شەوە نەوەستان کانیاوەمانیشیان تەقاندنەوە بۆ ئەوەی ووشك بن وەدەرختەکانیش بە شۆفەل لە هەندێك ناوچەی کوردستان لە ڕەگەوە دەرهێنا وە لە هەندێ ناوچەی تر سوتاندیان.

سەرنج بدەن سەبارەت بە برینی دارو درەخت پێغەمبەر ﷺ چی دەفەرمووێ :

﴿مَنْ قَطَعَ سِدْرَةً صَوَّبَ اللهُ رَأْسَهُ فِي النَّارِ"﴾[1].



واتە : ئەوەی درەختی (سِدْرَةً) شجرە نبق بە كوردی پێی دەڵێن مۆرد ببرێت بە بێ هیچ هۆیەك خودای گەورە سزای دەدات و بەسەردا دەهاوێژێنە دەیخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە .

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود/ رقم الحديث ٥٢٣٩ ص ٢٣٧٤ كتاب الأدب – باب- قطع السدر - حديث صحيح , / و مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح : رقم الحديث ٢٩٧٠ ج٦ ص١٥٠ .

بۆیە ئەوەی هەر درەختێك بەبێ هۆ ببرێت دەخرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە چونکە زیانی بە خەڵك وژینگە گەیاندووە .



کەواتە : سەددامی خۆێنرێژو عەلی حەسەن مجید و دارو دەستەیان لە نێو ئاگری دۆزەخدا سزای خودا دەچێژن چونکە ، ژینگەی کوردستانیان ژەهراوی کرد بە چەکی کیمایی هەروەها ، بەوەشەوە نەوەستان دارو درەختەکانیان لە رەگەوە هەڵکێشا بە شۆفەڵ و کانیاوەکانیشیان تەقاندنەوە ، سوپاس بۆ خودا بە چاوی خۆمان بینیمان لە سێدارەدران و رووڕەشی دونیاو قییامەتیشن لە دەرئەنجامی ئەو تاوانکارییەیان ئەوە پەیمانی خودایە ئا بەو جۆرە سزایان دەدات

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾[1].




---

(1) سورة آل عمران الآية ٩ .

پێویستە ئاگاداری ژینگە بین لە هەموو ڕوویەکەوە چونکە ، پیس بوونی یەکسانە بە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی هەموو جۆرە ئەو ژینگەیە خودا بۆی فەراهەم کردووین پاك و خاوێن ڕای بگرین نەك پێچەوانەکەی سەرەنج بدەن خاەنی ئەو کتێبە(الصحة والبيئة في التخطيط الطبي) چی دەڵێت سەبارەت بە پیس بوونی ژینگە :

( اتضح أثر هذه الأنواع من التلوث على الحالة الصحية العامة للسكان وخاصة تلوث المياه وعلاقته بأمراض المسالك البقلية وتلوث الهواء وعلاقته بانتشار الأمراض الصدرية والرمد والحميات ..)[1].

واتە : ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەست پێشخەر بووە لەو بوارەدا ، چۆن بتوانن لە نەخۆشییە گواستراوەکان خۆیان بەدوور بگرن ئەمە خۆپارێزییە سەرەتای ڕێگری کردنە لە پەتاو نەخۆشییە گواستراوەکان .

## موسڵمانان چی بکەن بۆ ئەوەی پارێزراوبن لە پەتاو نەخۆشی

لەو سۆنگەیەوە موسڵمانان دەبێت لە ئێستاو لە داهاتوو و ئاییندەشدا پێشەنگ بن مەبەستمان لەمەودوا لە شوێنەگشتییەکاندا خۆیان بپارێزن بەتایبەت لە مزگەوتەکاندا چونکە ، فەرشی مزگەوتەکان جۆرەها کەس نوێژیان لەسەر دەکات دەشێ ئەو فەرشانە هەموو جۆرە ڤایرۆسێك بە خۆوە بگرن ، بەهۆی ئەوەی هەموو کەسێك لەسەری نوێژ دەکات دوور نیە کەسانێك هەبن هەڵگری ڤایرۆسی نەخۆشییەکی گواستراوە بن ، کاتێك لەسەر هەمان فەرش نوێژ دەکەن. جا بۆ ئەوەی تووشی ئەو پەتا وەرزییانە نەبن زۆر گرنگە هەر کەسە بەرماڵی خۆی پێ بێت و دەمامك و دەستكێش بەکار بهێنی نەبادا نەخۆش بن و پێی نەزانن ببنە

---

[1] الصحة والبيئة في التخطيط الطبي / د خلف الله حسن محمد اللبان ص ٥٥ .

هۆکارێك بۆ گواستنەوەی ئەو پەتایە یا بە پێچەوانەوە خۆ پارێزییەکە لەو ڤایرۆسەیە بە فەرشی مزگەوتەکەوەیە.



زۆر نەخۆشی هەن دەگواسترێتەوە بێئەوی هەستی پێ بکەیت یا لە ڕێی بە بەکارهێنانی هەمان بەلوعەی ئاوی دەست نوێژەکە .

بۆیە : تا بۆتان دەکرێت لەماڵەوە دەست نوێژ بگرن ئینجا بچن بۆ مزگەوت سوننەتیش هەر وایە سەروەرمان محمد ﷺ دەفەرمووێت :

**﴿من تطهر في بيته، ثم مشى إلى بيت من بيوت الله، ليقضي فريضة من فرائض الله، كانت خطوتاه: إحداهما تحط خطيئة، والأخرى ترفع درجة﴾** [1].

واتە: ئەوەی لەماڵەوە دەست نوێژ دەگرێت و دەچێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژە

---

[1] صحيح مسلم بشرح الإمام النووي رقم الحديث ٦٦٦ ج٣ ص ٤٧٢ كتاب المساجد - باب المشي الى الصلاة تمحى به الخطايا وترفع به الدرجات .

فەرزەكان نەك نوێژە سوننەتەكان بە هەرهەنگاوێك گوناهێكی لێ هەڵدەوەرێت و پلەیەكیش بەرزدەبێتەوە لای خودای مەزن .




سەرنج بدەن ئەم تایبەتمەندییە بۆ ئەوانەیە لەماڵەوە دەست نوێژ دەگرن نەك لە مزگەوت .

بەداخەوە زۆرێك لە موسڵمانان ماڵیان بە تەنیشت مزگەوتەوەیە هەر لە مزگەوت دەست نوێژ دەگرن لە ماڵەوە دەست نوێژ ناگرن ئەو جۆرە كەسانە سوودمەند نابن لەو دەستكەوتەی لە فەرموودەكەدا هاتووە ، دەبێت فەرموودەكە وەكو خۆی جێبەجێ بكرێت پێویستە مامۆستایانی ئایینی بە وردی شرۆڤەو ڕاڤەی ئەو فەرموودەیە بكەن بۆ موسڵمان.

خاڵێكی گرنگ هەیە پێویستە ئاماژەی پێبكەین لەو فەرموودەیە ئەگەر ، بێتو موسڵمانان لە ماڵەوە دەست نوێژی خۆیان بگرن ، لە دەرئەنجامدا بەدوورن دەبن لە زۆرێك لەو نەخۆشییانەی دەگوازرێنەوە بە هۆی بەكارهێنان و بەركەوتن .

ئەمە زۆر بە زەقی هەستی پێدەكرێت لە مزگەوتەكان بەوەی كەسێك دێ هەمان

شوێنی ئەوەی لە پێش ئەودا دەستی بەئاوگەیاندووە بەکاردەهێنی لە پێ کردنی نەعلی مزگەوت و دەست دان لە هەمان مەسینەی ئاوی خۆ پاککردنەوە



لەوەیە ئەو کەسەی پێشی تۆ تووشبووی یەکێ لە نەخۆشییە گواستراوەکان بێت بۆ نموونە : نەخۆشی هەوکردنی جگەر یا نەخۆشی کۆلێرا یا ملاریا یا نیکاف یا تیفۆئید یا سکچوون یا ..یا .. هتد .

زۆر بە ئاسانی ( ئەو نەخۆشییانە لە شوێنە گشتییەکان دەگوازرێنەوە لە ڕێی بەرکەوتن و یا کۆکین و پژمینەوە بە تایبەت لە شوێنەداخراوەکان یاخود لە دەر ئەنجامی بەکارهێنانی کەلوپەل وپێداویستییەکانی کەسی تووشبوو کۆی ئەمانە هۆکاری سەرەکین بۆ تووشبوون بە نەخۆشییەگواستراوەکان )[1].

[1] الوقاية من الأمراض المعدية / د عبدالغني شهبندر ص ١٢٠-١٢١ .



عوامل العدوى : الافرازات الصدرية والانفية والقمية الحنجرية وربما كان الدم ايضاً من عوامل العدوى .

دور العدوى — الغالب ان العدوى تقع في كل ادوار المرض والاغلب انها في الدور الاول الحاد اكثر منه في بقية الادوار .

كيفية العدوى — يتصل المرض للانسان بواسطة الطرق التنفسية وذلك

١٢١

باستنشاق ما يتناثر من فم المريض وانفه اثناء السعال والعطاس والكلام وقد تقع العدوى بملامسة الاشياء الملوثة بافرازات المريض

الاسباب المهيئة = الازدحام والتعب الشديد والبرد والرطوبة وفساد الهواء والاحداث النفسية ، والسهر والانهماك بالمعاصي



تەماشا بكەن ئەو فەرموودەیە چ خۆ پاراستنێكی تەندروستی تێدایە بەدەوام ئەوانەی كە لەماڵەوە دەست نوێژی خۆیان دەگرن ، بەدوورو سەلامەتن لەو جۆرە نەخۆشییە گواستراوانە .

لە هەمان كاتدا موسڵمانان ئەبێ ئاگادار بن لە مزگەوت ئاو نەخۆنەوە تا دڵنیا

نەبن لە پاك و خاوێنی ئاوەكـە وە نابێـت هـەمان جـامی بـەكارهاتوو بـەكاربهێنن چونكە لەوەیە كەسێكی هەڵامەتاوی یا هـەر نەخۆشـییەكی تـر بـەكاری هێنابێـت تۆش هەمان جامی خواردنەوە بەكاردەهێنیت ئەوا نەخۆشییەكەت بۆ دەگوازرێتەوە بێنەوە هەستی پێ بكەیت .



لەمەودوا زۆر گرنگە ئەوانەی هەڵامەت دەگرن دەبێت نەچن بۆ نوێژی جومعـەو جەماعەت بۆ ئەوەی كەسی تر گرفتار نەكەن هەتا چاك دەبنـەوە وە هـەركاتێكیش چوونە شوێنە گشتی و قەرەباڵغەكانەوە دەبێت دەستكێش و دەمامـك بـەكاربهێنن ئەگینا گوناهبار دەبن .



لەوەیە کەسێك بڵێت بەڵگەتان لەسەر ئەمە چیە ؟؟؟؟ لە وەڵامیدا دەڵێین پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت : ﴿من أكل من هذه الشجرة - يعني: الثوم - فلا يأتين المساجد﴾[1] .



واتە : ئەوەى سيرى خوارد با نەچێتە مزگەوت هەر لەبەر بۆنى چونكە ، هەندێك لە موسڵمانان هەن بە بۆنى سير تێك دەچن واتە : نابێت موسڵمان ببێتە سەرچاوەى ئازار بۆ موسڵمانى تر بەتايبەت لە شوێنە گشتييەكان .

[1] صحيح مسلم بشرح الإمام النووي رقم الحديث ٥٦١ ج٣ ص ٣٦٦ كتاب المساجدو مواضع الصلاة - باب نهي من اكل ثوما او بصلا او كراثا أو نحوها .

سەرنج بدەن سەبارەت بە ئازاردانی ئیمانداران خوای مەزن چی دەفەرموێت :
﴿ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾[1] .

واتە : ئەوانەی ئازاری پیاوان و ژنانی ئیماندار دەدەن بێ ئەوەی هیچ تاوان و گوناهێکیان ئەنجام دابێت جا ئەو ئازارە بە زمان بێت یا بەکردەوە بەڕاستی ئەو جۆرە کەسانە باری خۆیان قورس کردووەوگوناهبارن دەبێ باجی ئەو تاوان وگوناهەیان بچێژن وسزا بدرێن .

کەواتە ئەوەی هەڵامەت و ئەنفلۆزاو نەخۆشی گواستراوەی هەیە نابێت بچێتە شوێنە گشتییەکانەوە مزگەوتیش یەکێکە لەو شوێنانە ، ئەگەر ڕۆیشتنە ئەو شوێنانە و کەسی تریان گرفتار کرد وەکو خۆیان ئەوا بێگومان گوناهبار دەبن .

کەسانێك هەن لە کۆمەڵگەدا خۆیان بە فریشتە ئەزانن لەڕووی خوداپەرستییەوە بەڵام ، زۆر بێئاگان لە چۆنیەتی پەیڕەوکردن و تێگەیشتن لە ئامانجە خوداییەکان (مقاصد الشريعة) وفەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ .

ناکرێت تۆ نەخۆش بی و چارەسەر وەرنەگریت یا بچیتە شوێنێکی گشتی بە هۆی تۆوە کەسانی تر گرفتاربن بۆ نموونە :

چوونە مزگەوت لەکاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی گەاستراوە کارەساتە دەتوانیت خوداپەرستییەکانت ئەنجام بدەیت لە ماڵەوە .

ئاشکرایە ئامادە بوون لە نوێژی جومعەو جەماعەت لە کاتی ئاساییدا خێرو پاداشتێکی زۆری هەیە بەڵام هەندێ جاری وا هەیە ناتوانیت ئامادەی جومعەو جەماعەت بی یا هۆکارێکی وا دێتە پێش دەستی مرۆڤدا نیە ئاخۆ دەشێت

---

[1] سورة الأحزاب الآية ٥٨ .

مەراسیمی جومعەو جەماعەت ڕابگیرێت ؟؟؟؟؟

ئاشکرایە زانایانی فیقهی ئیسلامی ئاماژەیان بۆ هەندێك هۆکاری گشتی کردووە زۆر گرنگە موسڵمانان بیزانن بۆ ئەوەی خەڵکانێك چەواشەیان نەکەن بەوەی ئەگەر بەرد بباریێت دەبێ ئامادەی جومعەو جماعەت بێ لەو هۆکارانە :

لە کاتی باران بارینێکی زۆر و ڕەشەباو زریان یاخود نەخۆش بێت ئەگەر بچێتە مزگەوت خراپتر دەبێ یا بترسێت لەستەمکارێك ئازاری بدات یا کەسێکی نەخۆشە پێویستی پێ بێت دەتوانی ئامادەی جومعەو جەماعەت نەبێ یا قەرزدارە خاوەنی قەرزەکە لەمزگەوت یەخەی پێدەگرێت یا ترسی ئەوەی هەیە لە ڕێگا تووشی دڕەندەیەك بێ نەتوانی خۆی لێ ڕزگار بکات یا ترسی ئەوەی هەبێ تووشی نەخۆشی دەبێت بەتایبەت لەم سەردەمەی ئێستاماندا ڤایرۆسی کۆرۆناو پەتای وەرزی مەترسیدار وەکو ئەنفلۆزای باڵندەو بەرازو یاخود ترسی ئەوەی هەبێ تووشی شتێکی نەخوازراو بێ ...... هتد .

زۆر گرنگە موسڵمانان لە وە تێبگەن پاراستنی ڕوح (حفظ النفس ) یەکێکە لە ئامانجە خوداییەکان (مقاصد الشريعة) لە زەروورییاتە.

واتە : پاراستنی ژیان وگیان(حفظ النفس ) لە پێشترە .

لەبەر ئەو هۆکارانەی خرانە ڕوو دەتوانن نەچنە مزگەوت لە ماڵەوە نوێژەکانتان بکەن چونکە ، سساغ وسەلامەتی گیانی موسڵمانان لە پێشترە تەنانەت شەرع و عەقڵ وامان پێ دەڵێت بۆ زیاتر ئاشنابوون بگەرێنەوە بۆ ئەو( کتێبە فیقهییانە)[1].

---

[1] المغني لابن القدامة : ج٢ ص٤٧٤ و ج٣ ص١٤ / المجموع للامام النووي :ج٤ ص ٩٨ تحقيق

پێویستە ڕاڤەی فەرموودەكانی پێغەمبەر بكەین و پەندو عیبرەتی لێوەرگرین نابێ هەر بە ڕووكەشی (سطحي) خوێندنەوەی بۆ بكەین بەڵكو دەبێ ماندوو بین پێوەی تاوەكو بكرێنە بنەماو یاسایەك بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوندی دونیاو دوارۆژمان (قیامەت).

وەكو ئاشكرایە هەندێك نەخۆشی گواستراوە هەن پێویستە مرۆڤ تا بۆی دەكرێت خۆی بەدوور بگرێت لێی نەبادا دووچاری بن و هەرەشە لەسەر ژیانتان دروست بكات .

سەرنجتان بۆ فەرموودەیەك ڕادەكێشم پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە نەخۆشی گولی چی فەرمووە : ﴿فِرَّ مِنَ المَجْذُومِ كما تَفِرُّ مِنَ الأسَدِ﴾[1]،

واتە لە كەسی گول (المَجْذُومِ) ڕا بكە و لێی دووربكەرەوە وەكو چۆن شێرێك دەبینی لە ترسی گیانی خۆت لێی ڕادەكەیت و هەڵدێیت.

---

وتعليق محمد نجيب المطيعي / الكافي في فقه الامام أحمد بن حنبل ج١ ص٢٨٨ / الفقه على مذاهب الأربعة : عبدالرحمن الجزيري :ج١ ص٣٨٨ / الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف على مذهب احمد بن حنبل ج٢ ص ٣٠٠ .

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٧٠٧ ج١٠ ص١٩٥ كتاب الطب - باب الجذام.



پەیامی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییە بێ جیاوازی چونکە ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهانیان تەماشا بکەن خودای مەزن لەم بارەیەوە چی دەفەرموویت : ﴿وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين﴾[1].

دەبێت ئەوەمان لا ساغ بێتەوە هەرچی نەخۆشی گواستراوە هەن پێویستە خۆمانی لێ بەدوور بگرین ئەو فەرموودەیە تەنها بۆ نەخۆشی گولی نیە بەتایبەت بەڵکو ، نموونەیەکە بۆ نەخۆشییە گواستراوەکانی تر ناکرێت پێغەمبەر ﷺ هەژماری هەموو ئەو نەخۆشییە گواستراوانەمان بۆ بکات.

---

[1] سورة الأنبياء الاية ١٠٧.



رجل نرويجي يبلغ من العمر ٢٤ سنة مصاب بالجذام، من سنة ١٨٨٦

کەواتە : هێڵە گشتییەکانمان بۆ دیاریکراوە بەڵام ، حوکمی شتەکانی تر دەبێت مرۆڤەکان بە ژیری(عقل)ی خۆیان بیدۆزنەوەو دەرکی پێبکەن .

دەتوانین ئەم فەرموودەیە بکەینە بنەماو یاسایەکی نەگۆڕ ، بۆ حوکم دان لەسەر نەخۆشییەکان ئایا گواستراوەن یاخود نا؟؟؟ ئەویش بە پشت بەستن بە ڕاپۆرتی پسپۆڕان لە پزیشك و شارەزایانی متمانە پێکراو لە بواری تەندروستی .

بڕوانن خودای مەزن چی دەفەرمووێت : ﴿ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾[1].

واتە : ئەگەر ، شتێکتان نەزانی لە ﴿أَهْلَ الذِّكْرِ﴾ پرسیار لەوانە بکەن کە تایبەتمەندن لەو بوارەدا.

بۆ نموونە : ﴿أَهْلَ الذِّكْرِ﴾ ئەوانەی تایبەتمەندن لە بواری ئایینی مامۆستایانی ئایینین و ئارەزای فیقهی ئیسلامین واتە پسپۆڕن ، وە ئەوانەی تایبەتمەندن لە بواری

[1] سورة النحل الآية ٤٣ .

تەندروستیدا پزیشكانن ، وە ئەوانەی تایبەتمەندن لە بواری بیناسازیدا ئەندازیارانن وە وە ئەوانەی تایبەتمەندن لە بواری ... وە ئەوانەی تایبەتمەندن ... هتد.

كەواتە : بۆ كەسی تر نیە جگە لەو پسپۆرو پزیشكانە بڕیار بدەن لەسەر بوون و نەبوونی ئەو نەخۆشییە مەترسیدارانەی دەگوازرێنەوە لە نێو كۆمەڵگە چونكە ، ئەوە گۆرەپان و مەیدانی ئەوانە هەر ئەوان دەتوانن ئەسپی خۆیان تیا تاو بدەن .

سەرنجتان بۆ فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ ڕادەكێشم سەبارەت بە كەسی تایبەتمەند و پسپۆری ورد( الأخصائي) لە نێو پزیشكەكانیشدا.

بڕواننە (زيد بن أسلم ) باس لەم هەڵویستەی پێشەوامان محمد ﷺ دەكات و دەڵێت:

**( أن رجلا أصابه جرح ، فاحتقن الدم ، وأن رسول الله - صلى الله عليه وسلم - دعا له رجلين من بني أنمار ، فقال : " أيكما أطب ؟ " فقال رجل : يا رسول الله ، أوفي الطب خير ؟ فقال له : " إن الذي أنزل الداء أنزل الدواء)[1].**

كابرایەك بریندار دەبێت وادیارە برینەكەی هەوی كردبوو (إلتهاب) ، لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺ دەنێرێتە شوێن دوو كەس بۆ ئەوەی چارەسەری بكەن

دیارە بە دكتۆر دەوترا حەكیم لەو سەردەمە كاتێك هاتن پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : كامتان تایبەتمەند ترە (پسپۆر) لەوی تر بۆ چارەسەر كردن .

[1] الإستذكار / رقم الحديث ٤٠٠٧٧ ج٢٧ ص ٣٥ باب تعالج المريض .



**یەکێ پرسیاری کرد ئەی پێغەمبەری خودا چارەسەرکردن سوودی هەیە؟؟؟؟؟**

پرسیارەکەی ڕەهبەرمان محمد ﷺ فەرمووی کامتان تایبەتمەند ترن ئەو پرسینەی پێغەمبەر ﷺ فێرمان دەکات بەدوای پسپۆری ورد بگەرێن هەرکاتێك کەسێك دووچاری ئێش و ئازارو نەخۆشییەك بوین نەبادا ڕاستەوخۆ خۆمان بخینە ژێردەستی کەسی نەزان و نا شارەزا واتە : هیچ پسپۆرییەکی نەبێت.

سەرنج بدەن سەروەرمان محمد ﷺ لەو بارەیەوە چی دەفەرمووێت :

﴿ من تطبَّبَ ولم يُعلمْ منهُ طبٌّ فهوَ ضامِن ﴾[1].

واتە : ئەوانەی هیچ زانستییەکی پزیشکییان نیە و چارەسەری خەڵکی دەکەن لە هەموو هەڵەیەکیان بەر پرسیارن بەرامبەر ئەو نەخۆشانەی چارەسەریان دەکەن

[1] مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح / رقم الحديث ٣٤٠٥ ج٦ص٦٢ كتاب الديات .

هەروەها دەبێت قەرەبووی نەخۆشەکان بکەنەوە لەو زیانەی لێیانکەوتووە بەهۆی نەزانینیەوە .

چونکە ، نەخۆشی نیە چارەسەری نەبێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (إن الذي أنزل الداء أنزل الدواء) نەخۆشی نیە خودای مەزن چارەسەری بۆ دانەنابێت .

کەواتە: ئەرکە (الواجب) لەسەر ئەوەی ئادەم بەتایبەت ئەوانەی پسپۆرو تایبەتمەندن لە بواری پزیشکی و تەندروستیدا هەوڵ وکۆشش بکەن بۆ دۆزینەوەی دەرمان و ڤاکسین(لقاح) بۆ ئەو نەخۆشییەیانەی بڵاودەبنەوە .

دەبێت ئێمەی موسڵمانان زۆر ئاگاداری ئەوە بین خۆمان هەڵنەقورتێنینە ئیش وکارو تایبەتمەندییەکانی ئەو پزیشك و پسپۆرانە ، نەبادا خەڵکی بە هەڵەدا بەرین وە ژیانیان بخەینە مەترسییەوە چونکە ، لە ڕۆژی دواییدا بەرپرسیار دەبین خودای باڵادەست لێ پێچینەوەمان لەگەڵ دەکات .

بەلامانەوە سەیرە هەندێك لە موسڵمانان بەتایبەت لەم سەردەمەدا ئەو ڤایرۆسە کوشندەیە ڕوحی ملیۆنەهای لە هەموو جیهاندا خستۆتە ژێر مەترسی مان و نەمانەوە کەچی دەیان بینی بۆ خۆیان پابەند نین بە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهان بۆ خۆ پاراستن لەو ڤایرۆسە مەترسیدارە لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکیش سارد دەکەنەوە لە گرتنەبەری ڕێکارە تەندروستییەکان بۆ خۆپارێزی لەو پەتایە .

وەکوو ئاماژەمان پێکرد دەبوو ئەوان پێشەنگ بوونایە لە بەرەنگاربوونەوەی مەترسی بڵاوبوونەوەی ئەو پەتایە نەك پێچەوانەکەی .

بە چوونیان بۆ نێو شوێنە گشتییەکان و تێکەڵاوبوونیان بە حوجەجەی ئەوەی چی خودا نەینووسێت نابێت و ڕوونادات .

زۆر ڕاستە لەگەڵ ئەوەی هاوڕاین لەگەڵ ئەم بۆچوونە بەڵام ، خۆ دەبێت دەست بە هۆکارەکانەوە بگرین بۆ خۆ پاراستن لەو پەتا کوشندەیە .

سەرنج بدەن خودا چی دەفەرمووێت :

﴿ولا تلقوا بأيديكم إلى التهلكة﴾[1].

واتە : خۆتان مەخەنە بارودۆخێکەوە بفەوتێن و لەناوبچن .

کەواتە : با بەدەستی خۆمان ئێمەی شوێنکەوتووی پێغەمبەر ﷺ نەبینە هۆکاری لە ناوچوونی خۆمان و خەڵکانی تر، بە پابەند نەبوون و پشت کردن لە هەموو ئەو ڕێنماییانەی شارەزایانی تەندروستی بۆ خۆ پارێزی لەو پەتا کوشندەیە.

دەبێت موسڵمانان هاوکاری تەواوی ئەو پزیشك و پسپۆرانە بن وە ڕێنماییەکانیان وەکوو ، خۆی جێبەجێ بکەن نەبادا تووشی ئەو ڤایرۆس و نەخۆشییە گواستراوانە بن کە هەڕەشە لەسەر ژیانیان دروست دەکات.

هەروەها دەبێ گرنگی بدەن بە پاك و خاوێنی لەش و گیان و پۆشاك و خواردن وخواردنەوە لە ماڵەوەو شوێنە گشتییەکان بەتایبەت لە مزگەوتەکان .

خۆ نابێت وەکو ئەو کابرایە بن کاتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی : ﴿ أرسل ناقتي وأتوكل قال اعقلها وتوكل﴾[2].

---

[1] سورة البقرة الاية ١٩٥ .

[2] صحيح ابن حبان رقم الحديث ٧٣١ ص ٣٠٦ . وسنن الترمذي رقم الحديث ٢٥١٧ ج٤ ص ٦٦٨ / حسن .



دیارە ئەو پیاوە دەشتەكییەی هاتۆتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری ئەوەی لە حەزرەتی محمد ﷺ كردووە ئایا وشترەكەم بەرەڵا بكەم و نەیبەستمەوە هەر پشت بەخودا ببەستم ؟؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی جارێ وشترەكەت ببەستەوە ئینجا پشت بە خودا ببەستە.

ئەم فەرموودەیە پێمان دەڵێت هەموو هۆكارەكان بگرنە بەر بۆ هەر شتێك دەتانەوێت ئەنجامی بدەن ئینجا پشت بە خودا ببەستن .

تەماشا بكەن خودا چی دەفەرموێت :

﴿ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾[1].

هەركاتێك بڕیاری خۆت دا ، پشت بە خودا ببەستە چونكە ، خودای مەزن ئەوانەی خۆش دەوێت كە پشتی پێ دەبەستن .

كەواتە : هەركاتێك بمانەوێت بڕیارێك بدەین بۆ هەر پرسێك ، دەبێت ڕاوێژ بكەین بە كەسی شارەزا و پسپۆر لەو بوارە تا بەر چاو ڕوونییەكمان هەبێت بۆ

---

[1] سورة آل عمران: الآية ١٥٩.

ئـەوەی بڕیـارێکی تەندروسـت بـدەین ئینجـا پشـت بـەخودا دەبەسـتین بـۆ دەرئەنجامەکانی .

پەیڕەوکردن و جێبەجێکردنی فەرمانـەکانی خـودای مـەزن و پابەنـد بـوون بـە ڕێنمـایی و ئامۆژگاریـەکانی پێغەمبـەر ﷺ گـەرەنتی بەدەسـتهێنانی تەندروستییەکی باش و دوور کەوتنەوەیە لە نەخۆشییە گواستراوەکان .

## چۆنیەتی خواردنی خورما :



زۆر گرنگە ئاماژە بکەین بە چۆنیەتی خواردنی مێوەهاتەکان بەتایبەت ئەوانەی ناوکدارن ، چونکە دەبێ بە شێوازێکی تەندروست بخورێن .

دیارە پێغەمبەر ﷺ هەندێ ڕێنمایی داوە سەبارەت بە خواردنی خورما بەو پێیەی ناوکدارە پێمان وایە (اللهُ أعْلَم) هەموو مێوەیەکی ناوکدار دەگرێتەوە تەنها خورما نیە بۆ نموونە : شووتی ناوکدارە





**قەیسی ناوكدارە**

جۆری تر هەن بەتایبەت ئەوانە لـە قاپێكدا دادەنـرێن نابێـت ناوكەكـەی دوای خواردنی لەهەمان قاپ دا دابنرێت چونكە ، پێچەوانەی ڕێنماییەكانی پێغەمبـەرە ﷺ.

بـڕوانن لـەم بارەیـەوە أنَـسِ (رَضِيَ اللّـهُ عَنْـهُ) چـی دەگێڕێتـەوە سـەبارەت بـە كۆكردنەوەی خورماو دەنكەكەی لەیەك قاپ دا دەڵێت :

﴿ أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ أَنْ يَضَعَ النَّوَى مَعَ التَّمْرِ عَلَى الطَّبَقِ ﴾[1].

---

[1] سنن الكبرى للبيهقي / رقم الحديث ١٤٦٣٦ ج٧ ص٤٥٨ كتاب الصداق - باب - ما جاء في

سەروەرمان محمد ﷺ پێی باش نەبووە بەڵكو حەزی نەكردووە خورما بەو شێوازە بخورێت .



نەبادا هۆكار بێ بۆ گواستنەوەی هەندێ نەخۆشی و پەتای گواستراوە بە هۆی ئەو لیكەی نێو دەم و بەكارهێنانی هەمان دەست بۆ دەركردنی ناوكەكە لەوەیە كەسی بەرامبەر ببینێت ئەو لیكەی دەستی بەرخورمایەكی تر كەوت بەڵام نەیخوارد وجێی هێشت جا ئەگەر ، خوانەخواستە نەخۆشییەكی گواستراوەی هەبوو بێگومان بەهۆی لیكەكەیەوە دەچێتە سەر ئەو خورمایەی دەستی بەریكەوتووە بێئەوەی ئاگای لێبێت .

هەر بۆیەوە پێغەمبەر ﷺ شێوازی خواردنی خورمای بۆ روون كردووینەتەوە هەر وەكو لەو فەرموودەیەدا هاتووە (عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بِشْرٍ-رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەگێرێتەوە :
﴿أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَلْقَتْ لَهُ أُمِّي قَطِيفَةً فَجَلَسَ عَلَيْهَا ، فَأَتَتْهُ بِتَمْرٍ فَجَعَلَ يَأْكُلُ وَيَقُولُ بِالنَّوَى هَكَذَا يَضَعُ النَّوَى عَلَى السَّبَّابَةِ ، وَالْوُسْطَى ...﴾[1] .

---

تفتيش التمر عند الأكل , هذا موقوف على أنس رضى الله عنه / و غذاء الألباب شرح منظومة الآداب ج٢ ص١٢٠.

(١) مسند أبي داود الطيالسي / رقم الحديث ١٣٥٧ ج٢ ص٦٠٨



وەکوو چۆن لە وێنەکەدا هاتووە بەو شێوازە دەخورێت بەو دووپەنجەیەی دەستی ڕاستە خورما هەڵدەگریت و دەیخەیتە دەمتەوە ، ئینجا ناوکەکەی لە دەمتەوە دەخەیتە سەر ئەو دوو پەنجەیەی دەستی چەپتەوە .

ئا بەو شێوازە( ئەتەکێتە) تەندروستییە خورماو مێوەهاتە ناوکدارەکانی هاوشێوەی دەخورێن .

کەواتە : خواردنی مێوە ناوکدارەکان بەو شێوازەی پێغەمبەر ﷺ فێری شوێنکەوتووانی کردووە بنەمایەکی تۆکمەو توندوتۆڵە بۆخۆپارستن وکەم کردنەوەو نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشییە گواستراوانەی مەترسیدارو هەڕەشەن لەسەر ژیانی تاکەکانی نێو کۆمەڵگە .

## كوژاندنەوەی ئاگر:

خودای گەورە دەفەرمووێ : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾[1].

پەیامی خودای مەزن بۆ ئیمانداران بریتیە :

لەوەی دەبێ بە ئاگا بن و بەردەوامیش لە ئامادەباشیدا بن بەرامبەر بە دوژمن و نەیارانیان .

دیارە دوو جۆرە دوژمن هەن بەرامبەر بە هەر كەسێك دوژمنێكی دیار و دوژمنێكی نادیارە ، ئێمە قسەمان لەسەر دوژمنە نادیارەكەیە لەم بابەتەماندا چونكە ، باس لە نەخۆشی و بنەماكانی خۆپارێزی دەكەین وادەخوازێت ئەم دوژمنە نادیارە ڤایرۆس و میكرۆبی زیان بەخش و دووكەڵی ژەهراوی بێ.

كەواتە : بە پێی ئەو ئایەتە پیرۆزە ﴿خُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ ئەركە (واجبە) لەسەر ئیمانداران خۆیان بپارێزن لە هەموو ئەو شتانەی هۆكاری سەرەكین بۆ تووشبوون بە نەخۆشی مەترسیدارو كوشندە ئەگینا گوناهبار دەبن.

ئاشكرایە یەكێك لەو هۆكارانە ئاگرە گەر ، ئاگادار نەبن لەوەیە لەناوتان بەرێت سەرنج بدەن سەبارەت بە ئاگر پێغەمبەر ﷺ چی دەفەرمووێت :

﴿ إِنَّ هذه النَّارَ إِنَّمَا هي عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فأَطفِئُوهَا عَنْكُمْ﴾[2]

---

[1] سورة النساء الآية ٧١ .

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٦٢٩٤ ج١١ ص ١٠٢ كتاب الاستئذان باب لاتترك النار في البيت عند النوم.

لـەم فەرموودەیـە پێغەمبـەر ﷺ ئاگـاداری و هۆشـداری دەدات لـەوەی ئـاگرِ دوژمنە لەو کاتانەی بێئاگا دەبن لێی ئەوەتا دەفەرمووێ :

لە کاتی نووستنتان ئاگرەکانتان بکوژێننەوە.

پێویسـتە زیـاتر لەسـەر ئـەم بابەتـە بـدوێین بەتایبـەت لـەم سـەردەمەدا هـەر پێداویستییەك و شت ومەکی کارەبایی ماڵەوەتان پریشـکی ئـاگرِ دروسـت بکـات دەبێ فەرامۆش و پشتگوێی نەخرێن بەڵکو ، دەبێ بە بەردەوامی چاودێری بکـرێن چونکە ، هـەر هەڵەیـەك لەوەیـە ژیـانی مـاڵ وخانـەوادەتانی تیـا بخەنـە مەترسـی نەمانەوە .




زۆرجاران بیستوومانە خێزانێك هەموویان مردوون بە هۆی ئەوەی شەو خەوتوون بـەڵام ، سـۆپای ماڵـەوەیان نەکوژاندۆتـەوە هۆکارەکەشـی پشـتگوێ خسـتنی فەرموودەکەی پێشەوامانە محمد ﷺ چونکە ، لەوەیە غازێکی ژەهراوی وەك

(co یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن)[١]، دروست بکات کاریگەری ئەم غازە ژەهراوی بوونە ژیانی کەسەکان دەخاتە مەترسیی مان ونەمانەوە ئەگەر ، زوو فریایان نەکەون ئەوا گیان لە دەست دەدەن .



پێویستە هەرچی سەرچاوەی ئاگر کەوتنەوەیە بە ڕۆژو شەو بەتایبەتی شەوان لە ژێر چاودێری چڕوپڕ بن چونکە ، هەر فەرامۆش کردنێك کارەساتی دڵتەزین بەدوای خۆی دێنێت.

[١] أحادي أكسيد الكربون أو أول أكسيد الكربون هو غاز عديم اللون، وعديم النكهة (الطعم)، وعديم الرائحة. ينتج من عملية الأكسدة الجزئية (الاحتراق غير التام للكربون) والمركبات العضوية مثل الفحم، وهذا يحدث عند ندرة الأكسيجين، أو عند احتراق ذي حرارة مرتفعة جداً. يعتبر من الغازات الشديدة السمية وهو من صور الكربون وأيضا بعض الزيوت والشحوم من الآلات والمركبات. أنظر الموسوعة الحرة .

أعراض التسمم بغاز أول أكسيد الكربون تتشابه إلى حد كبير مع الأعراض التي تؤثر على الجهاز العصبي المركزي. من المهم الوضع في الاعتبار حالة التسمم بغاز أول أكسيد الكربون عندما تكون إحدى المصادر السابقة متواجدة حول الشخص المصاب. وسوف تظهر عليه العلامات التالية: صداع، ارتباك وتشوش ذهني، ضيق في التنفس، ضعف، إرهاق، الإحساس بالدوار، عدم الثبات في الحركة أثناء المشي، غثيان وقيء، فقدان الوعي.

لون الجلد مع حالة التسمم بغاز أول أكسيد الكربون بخلاف الحالات التي يحدث فيها نقص الأكسجين في الدم، فإن المصاب بالتسمم من هذا الغاز تقريبا لا يتحول لون جلده إلى اللون الأزرق أو يصبح شاحبا وقد يتحول الجلد في الحالات الحادة إلى اللون الوردي الفاتح أو الأحمر. لكن هذا لا يحدث في كل حالات التسمم

هەروەها شەحنی مۆبایل و ئامێرە کارەباییەکان دەبێ ئاگادار بن لێیـان نابێـت بەجێیان بهێڵین و پشتگوێ بخرێن.



کەواتە : فەرمووده‌کەی سەروەرمان محمـد ﷺ تـەنها و تـەنها ئـاگر ناگرێتـەوە بەڵکو ، هەرچی ئامێری کارەبایی هەن سەرچاوەن بۆ ئاگر کەوتنەوەو پەیدا بـوونی دووکەڵی ژەهراوی دەبێ لە ماڵەوەو شـوێنی کـارکردن چـاودێری بکـرێن زووبـەزوو نەبادا ژیانتان بخاتە مەترسیی مان ونەمانەوە .

ئـا ئەمـەش بنەمایـەکی تـری خـۆ پارێزییـە ، بـە کوژاندنـەوەی هـەموو

سەرچاوەیەکی وەکو (سۆپای نەوتی و غازی ودار) وهەر ئامێرێکی کارەبایی مەترسی ئەوەی لێبکرێت ئاگر ودووکەڵی ژەهراوی لێبکەوێتەوە لەدەرئەنجامدا ژینگەی حەوانەوەو کارکردنتان پیس بکات و ژیانتان بخاتە مەترسی مان و نەمانەوە .



## پاراستنی ئاو لە پیس بوون :

خودای باڵادەست دەفەرموویت : ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾[1] .



واتە : هەرچی گیانلەبەران هەیە ئاو سەرچاوەی مانەوەیانە ، پێویستە سوپاسی ئەو خودایە بکەن لەسەر ئەو بەخششەی نابێت زیادەڕەوی بکرێت لە بەکارهێنانی ئاو چونکە ، ئەوە سامانێکی سروشتییە نابێ بە فیڕۆ بدرێت ئەگینا گوناهبار دەبن و بە کەسی زیادەڕەو لای خودای مەزن ناوزەند دەکرێن خوداش حەزی لە کەسی زیادەڕەو نیە تەماشا بکەن چی دەفەرمووێ : ﴿وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾[2] .

خۆ ئەوە پێغەمبەرە ﷺ بەلای (سعد)ی هاوەڵی تێدەپەڕێ و دەبینی خەریکی دەستنوێژگرتنە زیادەڕەوی دەکات لەبەکارهێنانی ئاوەکە سەرنج بدەن چی پێ دەفەرمووێ : ﴿ ما هذا السَّرَفُ يا سَعدُ ؟ قالَ : أفي الوضوءِ سَرفٌ قالَ : نعَم ، وإن كنتَ على نَهرٍ جارٍ﴾[3] .

---

[1] سورة الأنبياء الآية ٣٠.

[2] سورة الأنعام الآية ١٤١.

[3] شعب الإيمان للبيهقي / رقم الحديث ٢٧٨٨ ج٣ ص٣٠ باب الطهارات , / تخريج الأحاديث

هەروەكوو چۆن زیادەڕەوی لە بەكارهێنانی ئاودا پەسەند نیە ، پیس كردنیشی پەسەند نیە تەماشا بكەن پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە چی دەفەرمووێت :

﴿ لا يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ في المَاءِ الدَّائِمِ الذي لا يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيه ﴾ [1].




لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ هۆشداری دەدا لەوەی نابێت كەس میز بكاتە ئاوێكی وەستاوەوە كە لەبەری نەڕوات ، نەبادا كەسانێك هەبن خۆیانی تیا بشۆرن دیارە هۆكارەكەشی خۆپاراستنە لەكۆمەڵێ نەخۆشی گواستراوە و نەخۆشی دەروونی.

بۆ نموونە : نەخۆشی هەوكردنی جگەر و سكچوون و كۆلێراو هەندێ نەخۆشی تر دەگوازرێنەوە بۆ كەسانی تر لەرێگەی بەكارهێنانی ئاوی پیس و .... و .... هتد.

---

والآثار الواقعة في تفسير الكشاف للزمخشري تسلسل ٧٠٨ الحديث ١٦ ج٢ ص٢٦٩ .

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري / رقم ٢٣٩ ج ١ ص٤٤٩ كتاب الوضوء – باب- البول في الماء الدائم .



لە هەندێك ماڵ بانیۆ هەیە کەسانێك هەن میزی تێدەکەن لە پاشان خۆیان تیا دەشۆرن بێئەوەی پاکی بکەنەوە ، دوور نیە ئەو کەسەی میزەکەی تێدەکات هەڵگری یەکێك لە نەخۆشییە گواستراوەکان بێت لە پاش ئەو کەسێکی تر دێت خۆی دەشۆرێت ئەویش دەبێتە هەڵگری ئەو نەخۆشییە.

پێویستە مرۆڤ لەو شوێنەی خۆی دەشۆرێت پێش هەموو شتێك پاك و خاوێنی بکاتەوە ئینجا خۆی بشۆرێت تاوەکوو ، خۆی بپارێزێت لەو نەخۆشییانەی دەگوازرێنەوە هەروەها ، لە ڕووی شەرعیشەوە مرۆڤ تووشی وەسواسی دەبێت هەر لەو سۆنگەیەوە دەبینین پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەداوە میز بکرێتە شوێنی خۆشۆرین (الحمام) ، سەرنج بدەن لەو فەرموودەیە بدەن : ﴿نهى الرجل أن يبولَ في مُستحَمَه .....﴾[1].

وەسواسیش یەکێکە لە نەخۆشییە دەروونییەکان بڕوانن ئەو فەرموودەیە چ بنەمایەکەی بەهێزە بۆ خۆ پاراستن لە نەخۆشی دەروونی و جەستەیی .

[1] سنن الترمذي / الالباني رقم الحديث ٢١ ص١٧ - باب – كراهية البول في المغتسل حديث صحيح .

## پێکوتەی ڕوحی :

﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾[1].

گرنگە موسڵمانان لەوە حاڵی بن نەخۆشییەك نیە لەسەر ڕووی زەوی چارەسەری نەبێت هەر وەکوو چۆن پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

﴿ ما أنْزَلَ اللّهُ داءً إلّا أنْزَلَ له شِفاءً﴾[2].

لەگـەڵ ئـەوەی شـوێنکەوتووانی پێغەمبـەر ﷺ دەسـتیان بـە هۆکـاری خـۆ پارێزییـەوە گرتـووە لـە ڕووی پـاك وخـاوێنی و چـۆنیەتی خـواردن و بـەکارهێنانی دەرمـان چـوونە لای پزیشـکی تایبـەت و تێکـەڵ نـەبوون بەوانـەی نەخۆشـی گواسـتراوەیان هەیـە و ڕێنمـایی وئامۆژگارییـەکانی شـارەزاو پسـپۆرانی بـواری تەندروستیشیان جێبەجێکردووە .

لایەنێکی گرنگتر ماوەتەوە ئەویش لایەنی بەهێز کردنی ڕوحییە لە ڕێی چوونە ناو قەڵای خوداوە بۆ بەهێزکردن ودوور کەوتنەوە لەو هەموو تـرس و وەهـم و دڵـە ڕاوکێیەی ڕۆژانە لە ڕاگەیاندنەکان وسۆشیال میدیاوە بڵاودەکرێنەوە سـەبارەت بـەو نەخۆشییە گواستراوانەی ڕووی لـە کۆمەڵگـەی مرۆڤایـەتی کـردووە لەسـەر تاپـای جیهان وچۆنیەتی دۆزینەوەی ڤاکسین و پێکوتەی دژ بە ئـەنفلۆزای باڵنـدەو بـەرازو ئەنفلۆزا وەرزییەکان و ڤایرۆسی کۆرۆنایە جا بـۆ بـەهێزکرنی ئـەم لایەنـە ڕوحییـە

---

[1] سورة الرعد الآية ٢٨ .

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري / رقم الحديث ٥٦٧٨ج١٠ ص١٦٧ كتاب الطب .

پێویستە بە بیرو باوەڕێکی توندو تۆڵی پڕ لە متمانەوە بەردەوام ئەو ویردو زیکرانەی لە قورئانی پیرۆزو فەرمودە سەحیحەکانی پێشەوامان محمد ﷺ دا هاتووە بخوێنین تاوەکوو ، دڵنیایی تەواومان لا دروست بکات ئەوەی خودای مەزن فەرمانی پێ نەکردبێت تووشی نابین با لە هەموو دونیا نەخۆشی و ڤایرۆس تەشەنی کردبێت بەو مەرجەی هۆکارە ماددیەکانی خۆپارێزیتان فەرامۆش و پشت گوێ نەخستبێت .

## خوێندنی کۆتایی سورەتی (البَقَرَة)

ئەو پێکوتەیە لە قۆرئانی پیرۆزدا هاتووە تەماشا بکەن پێغەمبەر ﷺ چی دەفەرموێت : ﴿ الآيَتانِ من آخِرِ سُورَةِ البَقَرَة، مَن قَرَأهُما في لَيْلَة كَفَتاهُ ﴾[1].

واتە : هەر کەسێك ئەو دوو ئایەتە بخوێنێت :

﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ... ﴾[2].

لە کۆتایی سورەتی (البَقَرَة) بەسیەتی ، تووشی هیچ شتێکی نەخوازراو نابێت.

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري / رقم الحديث / ٤٠٠٨ ج٧ ص٣٩٦ كتاب المغازي / و صحيح إبن حبان / رقم الحديث ٢٥٧٥ ص٧٤٦ كتاب الصلاة .

[2] سورة البقرة الآية ٢٨٥-٢٨٦ .




**خوێندنی ئایەتی (الكُرْسِيّ)**

تەماشا بكەن پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەم ئایەتە چی دەفەرموویت :

﴿ إذَا أوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ، فَاقْرَأْ آيَةَ الكُرْسِيّ: (اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الحَيّ القَيُّومُ)[1] حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ، فإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ.. ﴾[2].

[1] سورة البقرة الآية ٢٥٥،

[2] فتح الباري شرح صحيح البخاري / رقم الحديث ٢٣١١ ج٤ص ٦١٣ كتاب الوكالة .




واته هەرکاتێك هاتیە سەر جێگاکەت پێش خەوتنت ئایەتی (الکُرْسِيْ) بخوێنە دڵنیابە پارێزاڕو دەبیت لە لایەن خوداوی مەزنەوە بە هیچ جۆرێك شەیتان نزیکت نابێتەوە واتە تووشی هیچ زیانێك نابیت .

زۆر گرنگ و پێویستە بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺ هەموو هۆکارەکانی خۆپارێزی بگرنە بە ماددی ومەعنەوییەوە ، ماددی مەبەستمان وەرگرتنی چارەسەرە ، بە چوونە لای پزیشکی پسپۆرو بەکارهێنانی دەرمان و دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی تووش بوون بە نەخۆشی و جێبەجێ کردنی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی شارەزاو پسپۆرانی بواری تەندروستی .

مەعنەویش مەبەست خۆوابەستەکردنە بە خوێندنی ئەو ویردو زیکرانەی پێغەمبەر ﷺ فێری هاوەڵانی کردووە بەیانیان ئێواران بیخوێنن تاوەکوو ، پارێزراو بن لە هەموو کێشەو نەخۆشی و زیانێك هەر بۆیە فەرموویەتی :

﴿ قل هو الله أحد والمعَوِّذتين حينَ تُمسي وحينَ تُصبحُ ثلاثَ مراتٍ تُكفيك مِن كلِّ شيءٍ ﴾[1] .

واتە : خوێندنی (قل هو الله و قل أعوذ برب الفلق و قل أعوذ برب الناس) سێ جار بەیانیان سێ ئیواران زامنە وتووشی هیچ زیان و شتێکی نەخوازراو نابن .

بێگومان شان بەشانی دەست گرتن بە هۆکارە ماددییەکانەوە ، خوێندنی ئەو ویردو زیکرانەی لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەی سەحیحی پێغەمبەردا ﷺ هاتوون دڵنیا کەرەوەی ئیماندارانە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو مەترسیانەی ڕووبەڕوویان دەبنەوە بەوەی هەرچی ترس و دڵەڕاوکێ و وەهم هەن دەرەوێنەوە لە دەرئەنجامدا بەرگری جەستە ( المناعة) بەهێز دەبێت بە پێچەوانەوە ترس بەرگری جەستە دائەبەزێنێت و مرۆڤ توانای بەرهەڵستی کردنی نەخۆشی کەم دەبێت .




[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٥٠٨٢ ص ٢٣١٧ كتاب الأدب حديث حسن .

## خوێندنی نزای

﴿ اللّهمّ إنّي أسألك  العافية في الدُنيا والآخرةِ اللّهـمّ أسألك العفوَ والعافيـة في ديني ودنيـايَ وأهلي ومالي اللّهمّ استر عورتي وقال عثمانُ عوراتي وآمِن رَوعاتي اللّهمّ احفظني من بينِ يـديّ ومـن خَلفي وعن يَميني وعَن شِمالي ومن فوقي وأعوذُ بعظمتِك أن اغتالَ من تحتي﴾[1].

سەرنج بدەن بەردەوام بەیانیان وئێواران پێغەمبەر ﷺ ئە ونزایەی دەکرد ڕۆژێك نەبوو نەیخوێنێت.

واتـــە :  خودایـــە داوات لێدەکـــەم و دەپارێمـــەوە بمپـــارێزە لـــە دونیـــاو دوارۆژدا(قیامـەت) لـێم خـۆش بـە ، خودایـە داوات لێدەکـەم و دەپارێمـەوە دیـنم سەلامەت بکە ماڵ و منداڵم و سەروەت سامانم سەلامەت بکەیت لـەم دونیایـە ، خودایە هەرچی کـەم وکـورتی وعـەیب و عـارم هەیـە داپـۆشـە ، خودایـە تـرس و دڵەراوکێیەکانم برەوێنەوە لـە هـەر چوارلامەوە بمپـارێزە وە پـەنادەگرم بـەزاتی تـۆ نەبادا بە ڕۆخی زەویدا بچم لەبەر تاوان وگوناهەکانم .

ئەوانەی ئەم نزایانەی سەروەرمان محمد ﷺ بەیانیان وئێـواران دووبارەدەکەنـەوە بێگومان ، خـودای مـەزن هێزێکـی ڕوحـی گـەورەیان پێدەبەخشـێت بـۆ ڕووبـەڕوو بوونەوەی هەرچی ترس وەهم و دڵەڕاوکێیەك هەن لە دونیاو لە قیامەت.

ئەم نزایە چ دەستکەوتێکی مەزنە بۆ ئیمانداران ، خۆیانی پێ پڕ چەك دەکـەن بۆ بەرهەڵستی کردن و خۆپارێزی ئەو هەڕەشە ومەترسـیانەی سـەر ئاینـدەیان لـە دونیاو قیامەت.

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٥٠٧٤ ص٢٣١٣ كتـاب الأدب حـديث صحيح.




**خوێندنی نزای**

﴿ اللّهمّ إنِّي أعوذُ بِكَ منَ البرصِ والجنونِ والجذامِ ومن سيِّئ الأسقامِ ﴾[1].

سەروەرمان محمد ﷺ بەردەوام شوێنکەوتووانی فێری ئەوە دەکرد پەنا بە خودا بگرن و نزاو پاڕانەوەکانیان بۆ بارەگای خودا بەرزبکەنەوە چونکە ئەو نزایانە جۆرێکە لە بەندایەتی کردنی خودای مەزن وە لەهەمان کاتدا کرۆکی متمانە بوون و باوەڕێکی تۆکمەیە بە خودای خاوەن توانایەکی ڕەهاو بەدەستەڵات ،

دەیفەرموو : ﴿ اللّهمّ إنِّي أعوذُ بِكَ منَ البرصِ ﴾ خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە نەخۆشی بەڵەکی

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ١٥٥٤ ص٧٣٧ كتاب الصلاة , حديث صحيح .



﴿اللّهمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ من الجنونِ﴾ خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە شێتی

واتە : ﴿لەدەست دانی عەقڵ (ژیری)﴾



﴿اللّهمَّ إنِّي أعوذُ بِكَ من الجذامِ﴾ خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە گولی ( الجذام) و



﴿اللّهمّ إنّي أعوذُ بِكَ من سيّئِ الأسقامِ﴾

خودایە پەنا ئەگرم لە(سيّئِ الأسقامِ) هەموو ئەو نەخۆشییە خراپانەی تووشی جەستەم دەبن .

**هەروەكو ئاشكرایە (سيّئِ الأسقامِ) ئەو نەخۆشیانەی لەم سەردەمە و ئایندەشدا سەرهەڵدەدەن سەرجەمیان دەگرێتەوە كۆرۆناو هاوشێوەكانییشی هەر دەچنە ریزی ئەو نەخۆشیانە ، گرنگە موسڵمانان بەردەوام ئەو نزایانە بخوێنن تاوەكوو ئەو هێزە ڕوحیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڤایرۆسەو هاوشێوەكانی بەرجەستە بكەن لە ناخییاندا شان بەشانی دەست گرتن بە هۆكارە مادییەكانەوە وەكوو لەوەو پێش ئاماژەمان پێكرد .**

كان من دعائه صلى الله عليه وسلّم:

**اللَّهُمَّ إنّي أعوذ بِكَ مِنَ البَرَص، والجُنون، والجُذام، ومِنْ سيئ الأسقام.**

صحيح الجامع الصغير للألباني برقم 1281

البرص: داءٌ معروف، وهو بياض يقع في الجسد،

الجنون: زوال العقل

الجذام: علة تسقط الشعر وتفتت اللحم وتجري الصديد مما ينفر الناس منه لبشاعته.

سيئ الأسقام: الأمراض القبيحة الرديئة.

**خوێندنی نزای**

( أعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ )[1].

حەزرەتی محمد ﷺ دەیفەرموو : مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي :

عن خولة بنت حكيم رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله ﷺ يقول

من نزل منزلا ثم قال: أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق لم يضره شيء حتى يرتحل من منزله ذلك

رواه مسلم

واته : خودایە پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانت مەبەست لە ناوە جوان

[1] المعجم الأوسط للطبراني / رقم الحديث ٥٢٣ ج١ ص ١٦٧ . / و صحيح إبن حبان رقم الحديث ١٠٢٢ ص٣٧٧ كتاب الرقائق .

وسیفەتە بەرزەكانی خوادی مەزنە (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ) لـە زیـان وخراپـەكاری دروستكراوەكانت (مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) .

هەڵبەتە ئەوانەی ئەم نزایە دەكەن بەیانیان و ئێواران جا لە هەر شـوێنێك بـن لە دەشت ودەروناوشار بن ، بێگومان پارێزراون تووشی هیچ زیان وخراپەكارییـەك نابن لەو بوونەوەرانەی خەڵق كراون بەتایبەت ئەوانەی بە زیان بـەخش ناسـراون لـە جانەوەرو بوونەوەرەكان .

## خوێندنی نزای

﴿ بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَـلَاثَ مَرَّاتٍ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ ﴾[1].

واتە : ناوی ئەو زاتی ﴿اللە﴾یە لەگەڵ هەر شتێكدا هێنرا جا ئەو شتە لـە زەوی دا بێ یاخود لە ئاسماندا بێ ، دڵنیا بن دووچاری هیچ زیان و خراپەیەك نابن بۆ ئەم مەبەستە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو :

(مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ).

واتە : ئەوانەی ئەو نزایە دەخوێننەوە بەیانیان وئێواران سێ جـار بـە ئیمـان و باوەڕێكی توندوتۆڵەوە ﴿لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ﴾ ئەوا تووشـی هـیچ شـتێكی نـەخوازراوو لـە ناكاو نابن.

---

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٥٠٨٨ ص٢٣١٨ كتاب الأدب , حديث صحيح .

**خوێندنی نزای**

**﴿ بِسْمِ اللهِ توكَّلتُ عَلَى اللهِ، وَلا حولَ وَلا قُوةَ إلاَّ بِاللّـهِ، يقـالُ لـهُ هُـديتَ وَكُفِيـتَ ووُقِيـتَ، وتنحَى عَنْهُ الشَّيْطَانُ ﴾[1].**

**پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : ئەوەی لەماڵەوە دەرچوو پشتی بە خودای باڵادەست بەست و وتی : خودایە بەبێ تواناو هێزودەستەڵاتی تۆ هیچ هەوڵ و هێزێکی تر نیە واتە :**

**هیچ شتێك نیە کاریگەری هەبێ بەرامبەر ئەوانەی خۆیان پشت ئەستور کردووە بە زاتی (الله) وە.**

**ئا لەو ساتەوەختەدا فریشتەکانی خودای مەزن (لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ)[2].**

**هەر بەفەرمانی خۆی دەڵێن :**

**رێت پیشان دراو چیتر پێویستیت بە کەسی تر نیە وپارێزراویت لە هەموو شتێکی زیانبەخش و شەیتان و دارو دەستەکەی لێت بە دوور دەبن و زیانیان بۆت نابێت .**

**بەڕاستی خوێندنی ئەو نزایانە رۆژانە بەپێی ڕێنماییەکانی سەروەرمان محمد ﷺ هێزو توانایەکی ڕادەبەدەر دەبەخشێت بە ئیمانداران لە هەمان کاتیشدا هەر چی**

---

[1] عون المعبود على شرح سنن أبي داود / رقم الحديث ٥٠٩٥ ص ٢٣٢١ كتاب الأدب حديث صحيح .

[2] سورة التحريم الآية ٦ .

ترس و وەهم و دڵە ڕاوکێیەك هەن لە نێو دڵیان نامێنێت بەوەش بەرگری جەستەیان بەهێز دەبێت (المناعة)ی پێ دەوترێت بە زمانی زانستی پزیشکەکان وەکو ئاشکرایە کاتێك تووشی هەر نەخۆشییەك دەبیت پزیشکی پسپۆر پێت دەڵێت مەترسە هیچ نیە چارەسەری نەخۆشییەکەت ئاسانە بە زووترین کات چاك دەبیتەوە ئا ئەم جۆرە قسانە ورەی نەخۆش بەرز دەکەنەوە لە دەرئەنجامدا بەرگری جەستەی بەهێز دەبێت بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی نەخۆشییەکە .

سوپاس بۆ خودا زۆری پزیشکەکان بەو ئاڕاستەیە کاری خۆیان دەکەن چونکە ، ئەو جۆرە قسەومامەڵەکردنە لەگەڵ نەخۆش نیوەی چارەسەرە وەنیوەکەی تری دەرمانەکانە .

هەرکاتێك ئیمانداران دەستیان بە هۆکارەکانەوە گرت مەبەستمان وەرگرتنی چارەسەرو خۆپارێزی وچوونە لای پزیشك و بەردەوام بوون لە خوێندنی ئەو ویردونزایانە دڵنیابن خودای گەورەش شیفاتان دەدات و بەدوور دەبن لە هەموو زیانێك .

## تەسبیحات کردن

بەڕاستی موسیبەت و تووش بوون بە نەخۆشی بەڵاو تەنگانەیە تووشی مرۆڤەکان دەبن ئەگەر چی ، خۆ ڕاگری و ئارامی و متمانە بوون بە خودای مەزن زۆر پێویستە لەو ساتەوەختەدا بەوەی هەرچی نەخۆشی هەیە لەسەر ڕووی زەوی بە بێ فەرمانی ئەو زاتی (الله) یە نابێت، وە لە هەمان کاتدا نەخۆشیەك نیە چارەسەری نەبێت پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموویت :

﴿ ما أَنْزَلَ اللَّهُ داءً إلَّا أَنْزَلَ له شِفاءً ﴾[1].

---

[1] فتح الباري شرح صحيح البخاري رقم الحديث ٥٦٧٨ ج١٠ ص ١٦٧ كتاب الطب .

کەواتە : چارەسەر هەن بۆ تێپەڕاندن ودەربازبون لە موسیبەت و بەڵاو نەخۆشی بە گەڕانەوە بۆ قورئانی پیرۆز و فەرموودەسەحیحەکانی پێغەمبەر ﷺ سەرنج بدەن خودا چی دەفەرموویت : ﴿فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ﴾[1].

ئاشکرایە ئەم ئایەتە باس لە حەزرەتی یونس دەکات چۆن رزگاری بوو لە نێو سکی نەهەنگەکە.

واتە : بەردەوام زاتی (الله) یان لە یاد نەکردووە بەڵکو ، هەر زیکری خودای کردووە لەکاتی ئاسایی وهێمنی دا ، لەدەرئەنجامی ئەو زیکردن وتەسبیحاتەی ڕۆژانە دەیکرد ڕزگارمان کرد .

کەواتە : یادکردنەوەی خودا زۆر پێویستە بۆ ئیمانداران لە هەموو کاتێکدا چونکە ، ڕزگارکەرە لە هەموو ناخۆشی و نەهامەتییەك مرۆڤی نەخۆش زۆر پێویستی بە زیکرکردن هەیە بۆ ئەوەی لەو ئێش وئازارەی رزگاری بێت وخودا شیفای بدات بیرمان نەچێیت ئەو زیکرکردنە دەبێ شان بەشانی وەرگرتنی چارەسەری پێویست بێت بۆ نەخۆشییەکەی و چوونە لای پزیشکی پسپۆر بێ . ئەوەتا ئیمامی شافعی رەحمەتی خودای لێ بێت دەڵێت : ﴿لَمْ أَرَ أَنْفَعَ لِلْوَبَاءِ مِنَ التَّسْبِيحِ﴾[2].

واتە : باشترین و بەسوودترین چارەسەر بۆ پەتاو نەخۆشی گواستراوە یادکردنەوەی خودایە بە زیکرکردنی .

لە کۆتایی ئەم بابەتەمان داواکارم خودای مەزن وڵات و نیشتمان و هەموو

[1] سورة الصافات الآية ١٤٣.

[2] حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ج٩ ص ١٣٦ .

جیهان لە نەخۆشی گواستراوەو ڤایرۆسە کوشندەو مەترسیدارەکان ڕزگار بکات ئامین ... ئامین ... ئامین .

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين .

## سەرچاوەكان


١. سنن ابن ماجه / للإمام الحافظ أبي عبدالله محمد بن يزيد بن ماجه القزويني - حققه وضبط نصه وخرج احاديثه وعلق عليه - شعيب الأرناؤوط و عادل مرشد و سعيد اللحام - دار الرسالة العالمية - الجمهورية العربية السورية - ط١ ١٤٣٠ - ٢٠٠٩ .

٢. سنن البيهقي الكبرى /للإمام أبي أحمد بن الحسين بن علي البيهقي - تحقيق - محمد عبدالقادر عطا - دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان ط٣ - ١٤٢٤ -٢٠٠٣ .

٣. سنن الترمذي /للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة الترمذي/ علق على أحاديثه وآثاره العلامة محمد ناصرالدين الألباني/ اعتنى به - أبو عبيدة مشهور بن حسن ال حسان / مكتبة المعارف للنشر والتوزيع- الرياض - ط١ ١٤١٧ .

٤. سنن النسائي الكبرى / للامام ابي عبدالرحمن احمد بن شعيب النسائي - قدم له / الدكتور عبدالله بن عبد المحسن التركي - اشرف عليه / شعيب الارنؤوط - حققه وخرج احاديثه / حسن عبدالمنعم شلبي -بمساعدة مكتب تحقيق التراث في مؤسسة الرسالة - مؤسسة الرسالة - بيروت - لبنان - ط١ ١٤٢١ - ٢٠٠١ .

٥. شرح صحيح مسلم للقاضي عياض المسمى / إكمال المعلم بفوائد مسلم / للامام الحافظ أبي الفضل عياض بن موسى بن عياض اليحصبي - تحقيق / الدكتور يحى إسماعيل - دار الوفاء ج م ع المنصورة - ط١ ١٤١٩ - ١٩٩٨.

٦. صحيح الأدب المفرد للإمام البخاري / بقلم محمد الناصر الألباني - مكتبة الدليل - المملكة العربية السعودية - ط٤ ١٤١٨ - ١٩٩٧ .

٧. صحيح مسلم/ شرح الإمام النووي- التحقيق محمد فؤاد عبدالباقي- دار إحياء التراث .
صحيح مسلم / المسمى المسند المختصر من السنن / مسلم بن الحجاج - المحقق - نظر بن محمد الفاريابي أبو قتيبة- الناشر - دار طيبة - الرياض - ط١ - ١٤٢٧ - ٢٠٠٦ .

٨. صحيح النسائي وهو المجتبى / للامام ابي عبدالرحمن احمدبن شعيب النسائي - خرج أحاديثه وعلق عليه - عماد الطيار و ياسرحسن و عزالدينن ضلي - مؤسسة الرسلة ناشرون - بيروت - لبنان ط١ ١٤٣٥ - ٢٠١٤ .

٩. فتح المنعم شرح صحيح مسلم / الأستاذ الدكتور موسى شاهين لاشين - دار الشروق - القاهرة ط١ ١٤٢٣ - ٢٠٠٢.

١٠. مسند الإمام أحمد بن الحنبل / حققه وخرج أحاديثه وعلق عليه - مجموعة من علماء الحديث في مكتبة دار السلام - تحت إشراف معالي الشيخ صالح بن عبدالعزيز بن محمد بن إبراهيم آل الشيخ - مكتبة دار السلام للنشر والتوزيع - الرياض ط١ ١٤٣٤ - ٢٠١٣.

١١. معرفة السنن والآثار ( السنن الوسطى) / البيهقي أحمد بن الحسين بن علي أبو بكر - تحقيق - عبدالمعطي أمين قلعجي - دار الوعي - حلب - ط١ - ١٤١٢ - ١٩٩١.

١٢. الذيل على طبقات الحنابلة/ تأليف الإمام الحافظ عبدالرحمن بن أحمد بن رجب - تحقيق وتعليق / د عبدالرحمن بن سليمان العثيمين - مكتبة العبيكان - مكة المكرمة - جامعة أم القرى بدون طبعة ١٤٢٤الهجرية.

١٣. صحيح ابن حبان /الامام ابي حاتم محمد بن حبان الخرساني- التحقيق الشيخ خليل بن مأمون شيحا- دار المعرفة/ بيروت - لبنان ط١ ١٤٢٥-٢٠٠٤.

١٤. زاد المعاد / لابن القيم الجوزية الإمام المحدث المفسر الفقيه شمس الدين أبي عبدالله محمد بن أبي بكر الزرعي الدمشقي - حقق نصوصه ، وخرج أحاديثه ، وعلق عليه / شعيب بن الأرنؤوط وعبدالقادر الأرنؤوط - مؤسسة الرسالة - بيروت - لبنان ط٤ ١٤٢٤ - ٢٠٠٣ .

١٥. الموافقات /لأبي إسحاق الشاطبي إبراهيم بن موسى اللخمي الغرناطي المالكي - شرحه وخرج أحاديثه فضيلة الشيخ عبدالله دراز - وضع تراجمه الأستاذ محمد عبدالله دراز - خرج آياته وفهرس موضوعاته عبدالسلام عبد الشافي محمد - دار الكتب العلمية - بيروت - لبنان ط٢ ٢٠٠٣ - ١٤٢٣ .

١٦. شمس العرب تسطع على الغرب أثر الحضارة العربية على الأوروبة / المستشرقة الألمانية زغريد هونكه - نقله عن الألمانية - فاروق بيضون و كمال دسوقي راجعه ووضع حواشيه - مارون عيسى الخوري - دار الجيل و الآفاق الجديدة بيروت - ط ٨ - ١٤٢٣ - ١٩٩٣ .

١٧. الأوبئة والتأريخ المرض والقوة والإمبريالية/ تأليف شلدون واتس - ترجمة وتقديم أحمد محمود عبدالجواد - مراجعة عماد صبحي - المركز القومي للترجمة - القاهرة - ط١ ٢٠١٠

١٨. کورتەیەک دەربارەی ڤایرۆسی کۆرۆنا / گروپی توێژینەوەی بایۆ مێدیکەڵ سەنتەری توێژینەوەی زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی - چاپخانەی نێرگز - چاپی ١ ساڵی ٢٠٢٠ .

١٩. الوقاية من الأمراض المعدية / الدكتور عبدالغني شهبندر – المطبعة الوطنية بيروت - بدون طبعة ١٣٤٨ – ١٩٢٩ .

٢٠. مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح / العلامة الشيخ علي بن سلطن محمد القاري – تحقيق / جمال عيتاني – بيروت – لبنان – دار الكتب العلمية – ط١ ١٤٢٢- ٢٠٠١ .

٢١. آفاق الطب الإسلامي رؤية علمية وتاريخ فلسفي / محمد الجوادي – دار الكلمة للنشر والتوزيع – مصر – القاهرة ط١ ١٤٣٦ - ٢١٠٥ .

٢٢. تأريخ أوروبا في العصور الوسطى / تأليف : موريس بيشوب / ترجمة: علي السيد علي - مكتبة المهتدين المجلس الأعلى للثقافة - القاهرة – ط١ ٢٠٠٥ .

٢٣. مدينة المسلمين في الاندلس /تأليف الأستاذ جوزيف ماك كيب - ترجمة من الانكليزية محمد تقي الدين الهلالي – مكتبة المعارف – الرباط – ط ٢ – ١٤٠٥ – ١٩٨٥ .

٢٤. فضل علماء المسلمين على الحضارة الأوروبية / د عزالدين فراج -مطبعة البردي – دار الفكر العربي – ١٤٢٣ – ٢٠٠٢ .

٢٥. نيل الأوطارشرح منتقى الأخيار/ الامام محمد بن علي بن محمد الشوكاني قدم له واعتنى به وخرج أحاديثه – رائد بن صبري بن أبي علفة – بيت الأفكار الدولية – لبنان – ٢٠٠٤ .

٢٦. الزينة في الكلمات الإسلامية العربية / الشيخ أبي حاتمأحمد بن حمدان الرازي – عارضه بأصوله وعلق عليه – حسين فيض الله الهمداني اليعربي الحرازي – مركز الدراسات والبحوث اليمني – صنعاء – ط١ – ١٤١٥ – ١٩٩٤ .

٢٧. معجم اللغة العربية المعاصرة / أ.د أحمد مختار عمر – عالم الكتب – القاهرة – ط١ – ١٤٢٩- ٢٠٠٨ .

٢٨. كتاب عن قبيلتي أحدثكم / غازي عبدالرحمن القصيمي – منشورات الزمان ط١ – ٢٠٠١.

٢٩. حدائق الحكمة أقوال أثورة من مدرسة الحياة / أعداد - نبيل أحمد – ط١ – ١٤٢٣ – ٢٠١٠.

٣٠. هةزار فةرموودةي سنن ابي داود / وةرطيَراني : ناصح إبراهيم سازاني – نوسينطةي تةفسير – هةولير – ضاثي يةكةم – سالَي ٢٠١٦ .

٣١. رواية الجحيم / دان براون – الدار العربية للعلوم – بيروت – لبنان – ط١ – ١٤٣٤-٢٠١٣ .

٣٢. قصة العلوم الطبية في الحضارة الإسلامية / د . راغب السرجاني – مؤسسة إقرأ – القاهرة – ط١ – ١٤٣٠ – ٢٠٠٩ .

٣٣. بيان الوهم والإيهام الواقعين في كتاب الأحكام / للحافظ ابن القطان الفاسي أبو الحسن علي بن محمد بن عبد الملك – دراسةوتحقيق – د حسين آيت سعيد – دار الطيبة للنشر والتوزيع السعودية – الرياض - ط١ ١٤١٧ – ١٩٩٧.

٣٤. كتاب الأحكام الوسطى من حديث النبي صلى الله عليه وسلم / الحافظالمحدث أبي محمد عبد الحق بن عبدالرحمن ابن عبدالله الأذري الإشبيلي – تحقيق - حمدي السلفي و صبحي السامرائي – مكتبة الرشد – الرياض – ١٤١٦ – ١٩٩٥.

٣٥. مغني المحتاج / شمس الدين محمد بن محمد الخطيب الشربيني – قدم له عماد زكي البارودي – حققه وخرج أحاديثه طه عبد الرؤف سعد – راجعه محمد عزت – المكتبة التوفيقية - القاهرة بدون طبعة .

٣٦. شرح فتح القدير / للامام كمال الدين المعروف بابن الهمام الحنفي على الهداية شرح باية المبتدي لشيخ الإسلام برهان الدين علي بن أبي بكرالمرغيناني- علق عليه وخرج اياته وأحاديثه الشيخ عبدالرزاق غالب المهدي – دار الكتب العلمية- بيروت – لبنان – ط١ ٢٠٠٣-١٤٢٤ .

٣٧. المغني لموفق الدين أبي محمد عبدالله بن احمد بن محمد بن قدامة المقدسي الدمشقي الحنبلي ويليه الشرح الكبير لشمس الدين عبدالرحمن بن محمد بن قدامة المقدسي – تحقيق الدكتور محمد شرف الدين خطاب و الدكتورالسيد محمد السيد – دار الحديث – القاهرة – سنة الطبع ١٤٢٥- ٢٠٠٤ .

٣٨. مواهب الجليل لشرح مختصر خليل / ابي عبدالله محمد بن محمد بن عبدالرحمن المغربي المعروف بالحطاب الرعيني و بأسفله التاج والإكليل لمختصر خليل - ضبطه وخرج اياته وأحاديثه الشيخ زكريا عميرات –دار الكتب العلمية – بيروت – لبنان - ط١ – ١٤١٦- ١٩٩٥ .

٣٩. الفقه الإسلامي وأدلته / أ.د وهبة الزحيلي - دار الفكر المعاصر -دمشق - ط٤ المعدلة ١٤٢٥- ٢٠٠٤ .

٤٠. رسالة في تأريخ الطب / الدكتور شوكت الشطي - مطبعة جامعة دمشق - ط١ - ١٣٧٩ - ١٩٦٩ .

٤١. مسند أبي داود الطيالسي / سليمان بن داود بن الجارود - تحقيق الدكتور محمد بن عبدالمحسن التركي - هجر للطباعة والنشر والتوزيع والاعلان - القاهرة - ط١ - ١٤٢٠ - ١٩٩٩ .

٤٣- تفوق طب الوقائي في الإسلام / عبدالحميد القضاة - تمت الفهرسة بمعرفة مديرية المكتبات والوثائق الوطنية - عمان - ط١ - ١٤٠٨ - ١٩٨٧ .

٤٤- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء / للحافظ أبي نعيم أحمد بن عبدالله الأصفهاني - دار الفكر للطباعة والنشر - بيروت - لبنان - ١٤١٦ - ١٩٩٦ .

٤٥- تخريج الأحاديث والآثار الواقعة في تفسير الكشاف للزمخشري / للحافظ جمال الدين ابي محمد الزيلعي - تقديم - الشيخ عبدالله عبدالرحمن السعد - اعتنى به - سلطان بن فهد الطبيشي - وزارة الشؤون الإسلامية والأوقاف والدعوة والإرشاد- المملكة العربية السعودية - ط١ ١٤٢٤ - ٢٠٠٣ .

٤٦- ختان الاناث أضراره وتحريمه في القرآن / أ.د مصطفى إبراهيم الزلمي - مطبعة شهاب - أربيل - ط١ ٢٠١١.

٤٧- الصحة والبيئة في التخطيط الطبي : د خلف الله حسن محمد اللبان - تقديم أ.د يسري الجوهري - دار المعرفة الجامعية - القاهرة - ١٤١٧ - ١٩٩٧ .

# ناوەرۆك



**ناو: سیروان ئەحمەد قادر**

بەرواری لەدایکبوون: ١٩٦١/٦/٢٤

باری کۆمەڵایەتی:خێزاندار

ناونیشان: کەرکوک – شۆراو

ئیمەیڵ : dmalasirwan@yahoo.com

ژمارەی مۆبایل:٠٧٧٠٤٣٦٣٣٨٨

**توانستی زانستی:**

١- دبلۆمی تەکنیکی لە پەیمانگای تەکنیکی کەرکوک لە ١٩٨١/٩/١

٢- ئیجازەی عیلمی (مەلایەتی) لە ساڵی (١٩٩٦).

٣- دکتۆرا لە دیراساتی ئیسلامی – پسپۆری ورد – فیقهی ئیسلامی – زانکۆی کۆیە ساڵی ٢٠٠٧ز

کاری ئێستا:خانەنشین

## بڵاوکراوە ولێکۆڵینەوە:

**یەکەم: نوسینەکان بەزمانی کوردی**

١- چەند وێستگەیەک لەژیانی پەرلەمانتاریم.

٢- چەند لاپەڕەیەک لەڕۆژانی ژیانم.

٣- شرۆڤەی گوڵبژێرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێشەوامان محمد ﷺ.

٤- مامەڵەكردن لەگەڵ نیعمەتەكانی خوادا.

٥- پێگەی دایك و باوك لە ئایینی ئیسلام دا .

٦- گەشبینی لە ڕوانگەی ئیسلام دا .

٧- ئەو پەیامانەی ئاراستەی ژیان دەگۆڕن .

**دووەم: نوسینەكان بەزمانی عەرەبی**

١- السياسة الشرعية وأثرها في بناء الأحكام وتطبيقها

٢- التأويل في ضوء أصول الفقه الاسلامي

٣- أحكام القيام والتقبيل في الفقه الاسلامي

٤- أربع سنوات في مجلس النواب العراقي

٥- كيفية محاربة الارهاب في إقليم كوردستان

٦- المخدرات والإدمان عليها

٧- حرية الرأي في الاسلام – بحث

**ئەرك وبەرپرسیاریەتی:**

یاریدەدەری تێبینەر – تێبینەرایەتی تۆماری خانوبەرەی چەمچەماڵ لە ١٩٨٢

١- پێشنوێژ، وتاربێژ لە كەركوك لە ١٩٩٧ -٢٠١٠

٢- ئەندامی ئەنجومەنی نوینەرانی عێراق لە ٢٠١٠-٢٠١٤.

# بنەماکانی خۆپارێزیی لە نەخۆشی لە ڕوانگەی ئیسلام دا

لەم نووسینەدا بنەماکانی خۆپارێزیی لە نەخۆشی لە دیدی ئیسلام دا، شرۆڤەی هەندێك لە دەقەکانی قورئانی پیرۆزو، فەرموودەکانی پێشەوامان محمد (صلی الله علیه وسلم)، تایبەت بە چۆنیەتی خۆپاراستن لەو نەخۆشی و پەتایانەی، کە ڕوو بەڕووی کەسەکان دەبنەوە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا.

هەروەها چۆنیەتی گرنگیدان بە تەندروستی جەستەو، پراکتیزەکردنی ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە باس لە: خۆپاککردنەوەو چۆنیەتی خواردن و کۆکین و پژمین و، هەندێك شێوازی خۆپاراستن دەکات.

دیارە لایەنی زانستیمان بەهەند وەرگرتووە، لە بابەتی پەتای (کۆڕۆنا-کۆڤید١٩) و، چۆنیەتی خۆپاراستن لە پەتاکانی هاوشێوەی (کۆڕۆنا-کۆڤید١٩) بەلامانەوە ئەمە، کۆتا پەتای درم نیە، کە تووشی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیی بۆتەوە، پێمانوایە: تووشی ڤایرۆس و پەتای تر دەبین، بەپێی تۆێژینەوە زانستییەکان .



نرخی 5.000 دینار
9 789922 654089

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com